د. ئەورەحمانی حاجی مارف



# ڕێزمانی کوردی



بەرگی یەکەم

## (وشەسازی)

بەشی چوارەم

ژمارە و ئاوەلکردار

بەغدا ـ ١٩٩٨

# پێشەکی

لە مێژە دوو بنەمای سەرەکی لە زماندا جیاکراوەتەوە : وشەکانی زمان و پێکهاتنی ڕێزمانی . هەر یەك لەو دوو بنەمایەش خاوەنی خاسیەتی خۆیەتی . وشەکانی زمان سەرجەمی ئەو وشانە دەگرنەوە ، کە لە زمانێکی دیاریکراودا هەیە . وشەکانی زمان لە بەشی لێکسیکۆلۆژیدا لێیان دەکۆڵرێتەوە ، کە سەرنج بۆ تایبەتێتی هەر وشەیەك ڕادەکێشرێ و بەر لە هەر شتێش لە ڕووی واتایەوە و جیاوازیی واتای لە وشەیێکی دی . پێکهاتنی ڕێزمانی ئەو هەموو خاسیەت و تایبەتێتیانە کۆدەکاتەوە ، کە لە کۆمەڵێ وشەدا وەك یەکن و بەر یەك یاسا دەکەون . کەواتە پێکهاتنی ڕێزمانی ئاوڕ لە تاکە تاکەی وشە ناداتەوە ، بەڵکو تەماشای دەستەو کۆمەڵەکانی دەکا .. لە هەندێ حاڵەتدا ماکی لێکسیکی و ڕێزمانی پێکەوە لە وشەدا بەدەردەکەون و بە ئاسانی دەتوانرێ جیابکرێنەوە[1]. بۆ نموونە لە وشەکانی : زوور ، لق ، کەو ... دا خاسیەتی سەربەخۆیان ئەوەیە ، کە بەر لە هەر شت واتای شوێنێکی ناسراو ، بەشێکی دیاریکراوی درەخت ، ڕەگەزێکی دەستنیشانکراوی باڵندە ... دەگەیەنن ... بەڵام هەموو ئەو وشانە پێکەوە و چەندین وشەی دیش لەگەڵیان ، خاوەنی خاسیەتی هاوبەشن : ١) ناون ، ٢) تاکن ، ٣) سادەن ... یاخود وشەکانی : ئەمڕۆ ، هەڵوەسین ... واتای لێکسیکیان بە نیشاندانی ڕووداوێکی ئاشکراوە بەندە : هاتوچۆ ، نامە ، نان ... ، بەڵام هەموویان

---

(1) ئێ. ف. ڤینۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ( وشەسازی ) ، مۆسکۆ ١٩٧٢ ، ل ٢٧ .

پێکەوە و چەندین کرداری دی خاوەنی خاسیەتی گشتیی ڕێزمانین :
۱) کاتی ئێستا ، ۲) کەسی یەکەم ، ۳) کۆ ...

لە حاڵاتی دیدا ماکی ڕێزمانی تەنیا لە یەکگرتنی وشەدا (لە ڕستەدا) دیاری دەکرێ . بۆ نموونە ، ئێمە کاتێ دەدوێین لە لایەکەوە دەشێ بڵێین ئازاد هات و لە لایێکی دیشەوە ، دەلوێ بڵێین : ئازاد هات ؟ لە حاڵەتی یەکەمدا ڕاگەیاندنی هەواڵێك و لە حاڵەتی دووەمدا پرسینی هەواڵێك لە ڕستەیێکی سەرلەبەردا دەربڕراوە . وشەکانی (ئازاد) ، (هات)نە ڕاگەیاندنی هەواڵ و نە پرسینی هەواڵ نیشان نادەن .

بەم شێوەیە ماکی ڕێزمانی ، کە وەسیلەی دەربڕینە ، بە تاکە تاکەی وشەوە بەند نییە ، بەڵکو بە ماکی وشەوە : مۆرفێم و ئەو ئامرازانەی لە ڕووی ئەرکەوە لێیەوە نێزیکن و هەروەها ئاوازو شێوەی ڕیزکردنی وشەکانەوە بەندە[2] .

ئەو نموونانەی هێنامانەوە ، ئەوە نیشاندەدەن ، کە وەسیلەی ڕێزمانی ، جۆرە واتایێك ڕادەگەیەنێ ، کە وەسیلەی لێکسیکی ڕای ناگەیەنێ . وەسیلەی ڕێزمانی ماکێکی یەکجار پێویستە لەتەك وەسیلەی لێکسیکیدا . گرنگیی وەسیلەی ڕێزمانی بەتایبەتی لەوەدایە ، کە یارمەتی بۆ دەربڕینی پێوەندیی گشتی ، نیشاندانی خاسیەتی تەجرید . بە هۆی بەکارهێنانییەوە ، پێوەندیی نێوان ئەو مەفهوومانەی بۆ ڕاگەیاندنی بیرێك پێویستە دادەمەزرێنرێ و دەگەیەنرێتە ئەنجام . لە بواری ئاخاوتندا ، ئێمە بیری خۆمان لە قاڵبی ڕستەدا دەردەبڕین . ڕستەش لە وشە پێكدێ ، کە بەپێی یاسای ڕێزمانی پێکەوە دەبەسترێن . وشەی پچڕپچڕ ، کە خاسیەت و پێوەندیی ڕێزمانی بەیەکەوەی نەبەستبن ، ناتوانن بیرێك دەربڕن . سەرپاکی وەسیلەی ڕێزمانی و دابەش

---

(۲) ف. م. بیریزین ، ب. ن. گۆلۆفین ، زمانناسیی گشتیی ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۹ ، ل ٤٧ .

ـوونیـانو پێـوەنـدیـیـان بینـای ڕێـزمـانیی زمـان پێکدێنن • ئـەو ...ـانیش خاوەنی پێکهـاتنی ڕێزمـانی تـایبەتی خۆیـەتی • پێکهـاتی ڕێزمانی خاسیەتێکی هەرە گرنگی زمانە و بە بێ ئەو زمـان پێکنـایـەت • لە هەمان کاتیشدا پێکهاتنی ڕێزمانی پێوەندیی هەمیشەیی بە وشەوە هەیە ، چونکە مالی ڕێزمانی لە وشە و دەستەواژەدا دەرکەوێ • جا بوونیـان و دەرکەوتنیان لە زماندا تەنیا لەسەر ئەم بنەمایەیە و دوور لە وشەوە ناتوانرێ ...یشـان بـدرێ[٣] •

پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین ، کە زاراوەی «ڕێزمان» بـە دوو ...انای جیاواز بەکاردێ : یەکەم ـ ئەوە دەگەیەنێ ، کە پێکهاتنی ڕێزمـانیی زمان بەشێکە لە بەشە پێکهێنەکـانی سیستـەمی گشتیی زمـان • دووەم ـ لێکۆڵینەوەی زانستی خستنەپێش چاوی ئـەو پێکهاتنـە ڕێـزمـانییە • وێکچوونیش لە نێوان ئەو دەستەواژانـەی «ڕێزمان»یـان تێدایە ، وەك : «یاسای ڕێزمانی» ، «دەستووری ڕێزمانی» ، «دیـاردەی ڕێزمـانی» ••• ئەوە دەگەیەنن ، کە : یەکەم ـ «ئـەوەی دەکەوێتـە پێکهـاتنی ڕێزمـانیی زمانـەوە ، بـوونێکی مەوزووعی هـەیـە»[٤] • دووەم ـ دامـەزرانـدنی زانستی زمان بۆ ئەو ڕێژە مەوزووعییانەی لەزمانەکەوە هەڵدەهێنجـرێن • ئەو ڕێژانەش دەشێ ڕاستبن و دەشێ هەڵـەبن[٥] •

لێکۆڵینەوەی ڕێزمـان لـەسـەر دوو بنـەمـا دامـەزراوە : وشـە و ڕستە • بەو پێیە دوو بـەشی سـەرەکی : وشـەسـازی (مـۆرفۆلـۆژی) و ڕستەسازی (سینتاکس) جیادەکرێتەوە• ئەگەرچی هەریەکێکیشیان خاوەنی

---

(٣) پ• ئا• بوداگۆف ، مرۆڤ و زمانی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ ، ل ١٠٢ •

(٤) ئا• ن• گفۆزدیێف ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمرۆ ، بەرگی یەکـەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٠٨ •

(٥) هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٨ •

بابەت و کەرەستە و مەبەستی خۆیەتی ، بەلاَم پێوەندی هەمەجۆریش لە نێوانیاندا هەیە[٦] .

جیاوازیی وشەسازیو ڕستەسازی لەوەدایە ، کە کەرەستەی پەیوەیەوەی وشەسازی ، وشەیە و ماکەکانی وشە شی‌دەکاتەوە ... هەرچی بابەتی ڕستەسازی‌یە ، لێدوانە لە ڕستە و ماکەکانی ڕستە لە شێوەی کۆمەلی جیاوازی وشەدا تا دەگاتە وشەی جیاجیا ، لە ئەندامی جۆربەجۆری ڕستەمن . ئەوەتە ڕستەسازی لێکۆلینەوەی خۆی لە وشەدا کۆتایی پێ‌دێنێ ، بەلاَم وشەسازی بەپێچەوانەوە توێژینەوەی خۆی لەوشەوە دەست‌پێ‌دەکات . بەو پێیە ، ئەگەرچی هەردوو وشەسازی و ڕستەسازی لە وشە دەدوێن ، بەلاَم لە قوڵی جیاوازەوە بۆی دەچن و پێوەندیی جیاوازی وشە لە سیستەمی گشتیی زماندا لێك‌دەدەنەوە[٧] .

وشەسازی کە لە وشە دەدوێ ، لە سیستەمی زمانەوە تێیان دەڕوانێ‌و پێوەندی‌یان لەگەڵ ماکەکانی دی هەمان سیستەم دیاری‌دەکا . بۆ نموونە : نێوانی قالبە جیاجیاکانی وشە لەسەر چ مەرج و پێوەندی‌یێك دامەزراوە.. ئەوەتە وشەی (باخ) لە حالەتی ناسیاوی‌دا دەبێتە (باخەکە)و لە حالەتی کۆدا ـ (باخان) ... وشەی (کەم) لە پلەی بەراورددا دەبێتە (کەمتر) ، لە پلەی بالاَدا ـ (کەمترین) ... (من) جێناوی جودایە بۆ کەسی یەکەمی تاكو ڕەك جێناوی لکاو لە قالبی (م)دا دەردەکەوێ ... چاوگی (هاتن) لە

(٦) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٢٤٢ .

(٧) ن. س. فالگینا ، د. ێ. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ف. ف. تسابکێفیچ ـ زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٣٩ .

ڕابوردووی نزیکدا دەبێتە (هات) . لە ڕابوردووی تەواودا – (هاتووە) ،
لەڕابوردووی بەردەوامدا – (دەهات) . لەڕابوردووی دووردا – (هاتبوو)
... وشەی (زێڕ) ناوە . کە پاشگری (–ین)ی دەچێتە سەر – (زێڕین)
دەبێتە ئاوەڵناو ... (جوان) ئاوەڵناوە ، کاتێ پاشگری (–ی) پێوە
دەلکێنرێ – (جوانی) دەبێتە ناو .. وشەسازی هەروەها لەڕەستەی
ڕێزمانیی گرووپی جیاجیای وشە نیشان دەدا ، دابەشبوونی وشە بەسەر
پۆلی گەورەدا دەردەخا . واتای ئەو پۆلانە ڕووندەکاتەوە و
پێوەندیی نێوانیان دیاری‌دەکا . هەر زمانێکیش خاوەنی سیستەمی
ڕێزمانیی خۆیەتی .

ڕستەسازی هێزی خۆی دەخاتە سەر ئەوەی ، ئەو وەسیلە
ڕێزمانی‌یانە چۆن لە پرۆتسێسی پێوەندیی بەستن و لەیەکتر گەیشتندا
بەکاردێنرێن . بۆ دەربڕینی بیر چۆن وشە پێکەوە گرێ‌دەدرێن ، چۆن
ڕستەیان لێ دروست‌دەکرێ . لە ڕستەسازی‌دا لە یەك ڕستەدا پێوەندیی
وشە بە وشەی دی‌یەوە باس‌دەکرێ[8] ، بۆیە ئەو جۆرە قالبانەی :
باخ ، باخەکە ، باخان ... لە ڕستەسازی‌دا پێوەندی‌یان بە وشەی دی‌یەوە
باس‌دەکرێ . بەوێنە لە ڕستەکانی : باخی پاشا پڕ گوڵی جوانە ، جوانیی
باخەکە بێ‌سنوورە ... نیشانی‌دەدا ، وشەی (باخ) چ دەورێك دەبینێ لە
پێکهێنانی ئەو ڕستانەدا ، بەتایبەتیش پێوەندیی نێوان وشەکانی
(باخی پاشا) ، (جوانیی باخەکە) ڕوون دەکاتەوەو پێوەندیی واتایی
وشەکان لەگەڵ وشەکانی دەوروبەریان ساغ دەکاتەوە . ئەم لایەنە لە
وشەسازی جیادەکاتەوە . بابەتی سەرەکی ڕستەسازی ، وەك نیشانماندا
بریتی‌یە لە ڕستە . وشە دوا ماکێتی و لێکۆڵینەوە لە بارەیەوە لە دوا
ئەنگاوی ڕستەدا دێت .

---

(8) یو. س. ستیپانۆف ، بنەماکانی زمانناسیی گشتی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ ،
ل ١٤٦ .

. وشەسازی و ڕستەسازی یاریدەی هێنانەدی یەك مەبەست دەدەن ،
ئەویش دەربڕینی بیرە بە زمان . لە بەر ئەو هۆیەیە لە زمانی کوردیدا
پێکۆلینەوە لەو دوو بەشە هاوبایەخە ـ گۆڕانی وشە و ڕیزبوونی وشە ـ
لە پێوەندیی تەواو لە نێوانیاندا هەیە ، وەك یەك گرنگو پێویستن .

دەستوورەکانی ڕێزمان چینی هەرە بەرینی وشە دەکرنەوە .
بوونە ، ڕێکەوتنی ئاوەلناو یان کردار چ لەو وشانەی لە زووەوە لە زماندا
هەن و چ لەو وشە نوێیانەی تازە ڕۆنراون و چ لەو وشانەی لە دیالێکتی
ـی یەوە کەوتوونەتەوە و چ لەو وشانەی لە زمانانی دی یەوە وەرگیراون ..
وەك یەك بەربڵاون .

ڕێکەوتنی بەجێ‌هێنانی ئەرکیش بە هەمان جۆرە ، با وشەکە مانای
جۆربەجۆریشی هەبێ . بەوێنە کرداری (دەڕوا) لەگەڵ کارادا ڕێ‌دەکەوێ ،
ئەرچی لە حاڵاتی جیاوازدا واتای دی‌یش بگەیەنێ . لەتەك کارایەکدا لە
حاڵەتی کۆدا بێ : منداڵەکان دەڕۆن بۆ قوتابخانە ، ئوتومبیلەکان دەڕۆن
بۆ هەولێر ، ئیشەکانمان دەڕۆن ... لەگەڵ کارای تاکدا : منداڵەکە دەڕوا
بۆ ماڵەوە ، ئوتومبیلەکە دەڕوا بۆ هەولێر ، ئیشەکەمان دەڕوا ...

بۆیە کاتێ خاسیەت و واتای پێکهاتنێکی ڕێزمانی دەست‌نیشان دەکرێ
پێویستە ئەوە لەبیر نەکرێ ، کە ڕەنگە ئەو واتایە تەنیا شتێکی زۆر گشتی
بێ ، هەڵەیەکی گەورە بێ .. بەپێچەوانەوە لەسەر بناغەی واتای
دیاریکراوی وشە و ڕستە ، واتای تەواوی ڕێزمانی لێك‌دەدرێتەوە .
لەم حاڵەتەدا ڕێزمان لەگەڵ لێکسیکدا تێکەڵ دەبێ[٩] .

لەم ڕووەوە پرۆفیسۆر ئا. م. پیشکۆڤسکی باش واتای حاڵاتی
نیشانداوە ، کە وتوویە : «لەبەر ئەوەی واتای حاڵات بە شێوەیێکی چڕ
بەندە بە واتای مادی و ڕابەرایەتیی وشە و وشەی بەرێوەبراوەوە ، بۆیە

---

(٩) ف. ئی. کۆدوخۆف ، سەرەتایێکی زمانناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ ، ل ٢٥٩

تۆژەر پیر لەوە دەکاتەوە ، لێرەدا چەند جۆر هەبێ و واتای مادی یەکێك لە ماکە پێکهاتووەکان چەند جۆر دیاری بکرێ و هەندێ جۆر تیزافەی ئەو ناوێتەیە بکرێ ، کە حالاتی جیاواز سازیان کردووە »[10].

کەوابوو نیشاندانی خاسیەتی ئەو جۆرە دیاردە ڕێزمانییانە ، وەك : ئارا و پەرکار ، نیهاد و گوزارە ، ناو و ئاوەڵناو ... کە لە زماندا لەڕادەی بێسنووردا دەبینرێن و وشەی هەمەجۆریان گرتووەتە خۆ ، پێویستە باش جیابکرێتەوە ، کە چی سەر بە کام دیاردەی ڕێزمانییە و کام وشە ، کام پێکهاتن پەردەکاتەوە .

لە وشەسازیدا حالاتی ڕێزمانی لە پلەی یەکەمدا دێ . وشە لە ڕووی پێوەندیی واتاوە ، دانەیێکی ساکار نییە ، کە تەنیا یەك واتای هەبێ ، بەڵکو چەند واتایێکی جیاوازی هەیە و هاوکارن : لەتەك واتای سەرەکیی سەربەخۆی وشەیێکی دیاریکراودا ، دەشێ چەند واتایێکی تەواوکەری دی هەبێ ، کە تایبەت نەبن بە تاکە وشەیەکەوە ، بەڵکو تایبەت بن بە کۆمەڵێکی گەورەی وشەوە .[11]

بۆ نموونە ، بۆ ژمارەیێکی بێسنووری وشە واتای کۆی تەواوکەر هەیە : باخان ، شاران ، پیاوان ، دەڕۆن ، دەنووسن ، دەفرۆشن ...

---

(10) ئا. م. پیشکۆفسکی ، ڕستەسازیی ڕووسی لەبەر ڕووناکیی زانستدا ، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، 1956 ل 291 – 292 .

(11) م. دۆکوولیل ، کێشەی حالەتەکانی وشەسازی ، گۆڤاری «کێشەی زمانناسی » ، ژ 6 ، مۆسکۆ ، 1967 ، ل 73 .

وەك لە نموونەكاندا دیارە ، ئەم واتایە بۆ تاكە وشەیێك نییە . بەڵكو
ڕووپی گەورە گەورەی وشەیە . لەگەڵ تاكە وشەیەكدا وەك واتایێكی
- بڕ و بۆ سەر واتا سەرەكییەكە خۆی دەنوێنێ . واتای سەردنی
ای : (باخ) - شوێنی گوڵو درەختە ، (دەڕۆن) - بزووتنەوە لە
شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیە ... بەڵام لەنەك ئەو واتا سەرەكییە
ربەجۆرانەدا ، واتای تەواوكەریشیان هەیە ، ئەویش واتایێكی
گشتییە بۆ سەرجەمیان و بۆ ژمارەیێكی بێشوماری دی وشە . ئەو واتا
ییەش ، واتای كۆیە . ئەو واتا سەرەكییەی لە تەنیا وشەیێكی
ری كراودا هەیە ، لە زانستی زماندا (واتای لێكسیكی) پێدەوترێ .
ی تەواوكەری گشتییش ، كە خاسیەتی كۆمەڵە وشەیێكی زۆرە . بە
ی ڕێزمانی) ناونراوە[١٢] .

تایبەتیی واتای ڕێزمانی ئەوەیە ، كە بە كەرەستەی دیوی دەرەوەی
زمان دەردەبڕدرێ . كەرەستەی ئەم حالەتە هەندێ پارچەی وشەیە ،
ك : كۆتایی . ئەمەش بە ئاسانی لە بەراوردكردنی : باخ - باخان ،
ڕوا - دەڕۆن ...دا دەبینرێ . ئەو كەرەستە دەرەكییانەی واتای
ڕێزمانی دەگەیەنن ، هەروەها خاسیەتی كۆمەڵە وشەی زۆرن و بڕێتین لە
كەرەستەی ڕێزمانی . بۆ نموونە ، نیشانەی كۆی (ان،ن) تەنیا لەو وشانەدا
بەدی ناكرێن ، كە لە سەرەوە خستمانە پێش چاو ، بەڵكو لەگەڵ دەستەو

(١٢) ئا. ئی. كولانۆڤ ، وشەسازیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، مۆسكۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٢ .

(١٣) ئا. ئی. سامیرنیتسكی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسكۆ ، ١٩٥٩ ، ل ١٠٤ .

ترمەنی دی‌یشدا دەبینرێن ، بەوێنە . ڕۆژان . چاوان . جاران ، تێیران...،
..تۆن ، دەمرن ، ڕادەکەن ، دەکرن... و سەدانی دی‌دا . بەو پێیە بەو
هەموو دیاردەیێکی زمان ئەم جۆرە کەرەستە دەرەکی‌یەی زمان ماناییەی
پێویستە بۆ دەربڕینی ماناى ڕێزمانی ، چونکە لەسەر بناغەی ئەو مانایانە
مەبەست پێک‌دێنرێ‌و لە یەکێکەوە دەگەیەنرێ بە یەکێکی دی .
بۆیە واتای ڕێزمانی و کەرەستەی دەربڕینی ڕێزمانی پێوەندیی
هەمیشەیی‌یان لە نێواندا هەیە و لە زماندا بە جیاجیا نابن[14].

ئەم پێوەندی‌یەی نێوان واتای ڕێزمانی و کەرەستەی ڕێزمانی لە
زانستی زماندا بە (حاڵاتی ڕێزمانی) ناسراوە[15].

نموونەی حاڵاتی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا : ژمارە ، دۆخ ،
ناسیاوی ، کات ، کەس ... ن . وەك دواتر دەردەکەوێ ، هەر یەك لەمانە
خاوەنی واتای ڕێزمانیی خۆی و کەرەستەی دەربڕینی ڕێزمانیی خۆیەتی .

حاڵاتی ڕێزمانی بریتی‌یە لە یەکێتی واتای ڕێزمانی و کەرەستەی
دەربڕینی ڕێزمانی ئەو واتایانە . هەردووکیان ماکی پێویستی هەر
حاڵەتێکی ڕێزمانیی پێکهاتنی ڕێزمانی زمانن .

لە لێکۆڵینەوەی حاڵاتی ڕێزمانی‌دا ، هەندێ لە نووسەران ڕووی واتا
ڕەچاو دەکەن . لەم بارەدا حاڵاتی ڕێزمانی دەشێ وا دیاری بکرێ ، کە

---

(14) هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٦ .

(15) ئا. س. چیکۆباڤا ، سەرەتایێکی زمانناسی ، بەرگی یەکەم ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٥٣ .

ـﻪك تايبەتێتی زمان ، دەربڕینی ماناى ڕێزمانی لە کەرەستـەی ڕێـزمـانیی
رمانەوە وەردەگیرێ ٠ نووسەرانی دی لـە کـەرەستـەی ڕێـزمـانییـەوە
ـەنواڕن ٠ لەم بارەدا دەکرێ حالاتی ڕێزمانی وەك یەککرتنی کەرەســەی
ڕێزمانی بۆ یاریدەی دەربڕینی واتایێکی ڕێزمانیی ناسراو تەماشابکـرێ ٠
بەو پێیە کـە کەرەستـەی ڕێزمانی بـۆ مـەبەستی گـەیـاندنی واتـایـە ،
خـاسیەتی حـالاتی ڕێزمـانی لـە واتـاکـانیانـەوە دەستپێدەکـات ٠ بێ
ڕەچاوکردنی واتا تەنانـەت نـاتوانرێ ئـەوە بچەسپێنـرێ ، کـە خـاوەنی
کەرەستەیێکی ڕێزمانیی ناسراوە[١٦]٠ بۆ نموونە کۆتایی (ـ ێ) لە وشـەی
(کچێ)دا دەربڕینی دۆخی بـانگهێشتنی (کـچ)ە ، کـە ناوە : کچێ وەرە ٠
بێ تێگەیشتن لە ماناى وشە ، ناتوانرێ بڕیاربدرێ ،کە ئەو دەنگە ناسراوە
کەرەستەی ڕێزمانییە یان نا ٠ بۆ نموونە ، هەمان دەنگی (ێ)ی کۆتـایی ،
کە لە وشەی وەك : هەرمێ ، پێ ، جێ ٠٠ شدا هەیە ، کۆتایی وشە نین و
کـەرەستـەی ڕێزمـانی نین ٠

پێویستە ئەوە لەیاد نەکرێ ، کە لە نێوان واتا و کەرەستەی دەربڕینی
ئەو واتایەدا پێوەندیی ئاڵۆز هەیە ٠ ئەوەتە زۆر جار واتـایێکی ڕێزمـانی ،
دەکرێ بە کەرەستەی ڕێزمانیی جیاواز دەرببڕرێ ٠ بـۆ نموونـە ، واتـای
کردارێ تێپەڕ چۆن بە یاریدەی پاشگری (ـاندن) : (گەڕان ـ گەڕاندن ؛
مـردن ـ مـرانـدن ٠٠٠ ) ڕادەگـەیـەنرێ ، هـەروەهـا بـە
گۆڕینی کۆتایی (بران ـ بردن ، پچڕان ـ پچڕین٠٠٠)یش سازدەکرێ ٠٠٠
بەپێچەوانەشەوە تـاکە کەرەستەیێکی ڕێزمانی ، دەتـوانێ واتـای حـالاتی
جیاواز بگەیەنێ ٠ بەوێنە لـە (ئێـوە هـاتن) و (ئـەوان هـاتن)دا (ن) لـە
یەکەمدا واتای کەسی دووەمی کۆ دەگەیەنێ ، کەچی لە دووەمـدا واتـای
کـەسی سـێـیـەم دەدات ٠

(١٦) ئی٠ ئۆ٠ کۆستیتیسکایا ، ڤ٠ ئی٠ کارداشیێڤسکی ، ڕێزمانی فەرەنسی ٠
چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٦٢ ـ ٦٣ ٠

هەرچەندە کەرەستەی ڕێزمانی ، وەك شتێکی ئاسایی بە واتایێکی ناسـراوەوە بـەنـدە ، بـەڵام لـە هـەندێ حـاڵەتدا دەشێ ئـەو واتـایـە ڕانەگەیەنێ . بۆ نموونە ئاشکرایە کە کۆتایی (ـان) واتای کۆ دەگەیەنێ: کچان ، کوڕان ، لاوان ... بەڵام وشـەی وەك : میـران ، سەیـران لـەو واتایە بێبەرن ، چونکـە چـۆن دەتوانین بڵێین : (میـرانی سـۆران جێی شانازیی کوردن . خەڵك بەهاران دەچنە سـەیران ..) بە هەمـان چـەشن دەتـوانین بڵێیـن : (میـران کـوڕێکـي زیـرەکـە ، میـران ! ئـێستە دەچم . سەیرانەکەمان خۆش بوو ...) . وێڕای ئـەوە هـەر یـەك کەرەستە ، بەتایبەتی یەك کۆتایی ، یەکسـەر دەتـوانێ چـەنـد واتـایێکی ڕێزمانی بگەیەنێ و سەر بە چەند حاڵەتێك بێ . بە وێنە (ـ م) ـ دەچم ، دەڕۆم ، دەبەم ... لـە لایەکەوە دەبێتـە نیشـانـەی کـەسی یـەکـەم و حاڵەتی کەس دەردەبڕێ . لە لایەیێکی دییەوە ڕاگەیەنێ ژمارەی تـاکەو پێوەندی بە حاڵەتی ژمارەوە هەیە .

حاڵەتی ڕێزمانی لە سیستەمی زماندا خاوەنی پێوەندیی جۆربەجۆرونو دەوری جیاواز دەبینن . حاڵەتی کەم و زۆری گشتیتی هـەیـە و ئـەوەتـە بەشێك لە سنووری بەشێکی دیدا ئەرك دەبینن ، یاخود هەندێ حـاڵـەت لە لایـەکەوە یەك دەگرنو لـە لایێکی دیـیەوە لـە یـەك جیـادەبنـەوە . هەر یەك حاڵەت بەپێی پێوەندی بە حاڵاتی دییەوە دەتوانێ دەوری جیاجیا ببینێ . پێوەندیی حاڵاتی جیاجیا بە لێکسیکەوە وەك یەك نین[١٧] .

(١٧) ف. ئا. ژڤێگینسێڤ ، زمان و تیۆریی زمانناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٨٤ .

حالآتی ڕێزمانی بەپێی پێوەندی بە بینای زمانەوە لە زمانانی جیاوازدا وەك یەك نین • بۆ نموونە زمانی کوردی خاسیەتی حالەتی ناسیاوی و نەناسیاوی هەیە و ئەم حالەتەش بە یاریدەی نیشانەی ناسیاوی‌و نەناسیاوی دەردەبڕێ ، کەچی لە زمانی ڕووسیدا خاسیەتی حالەتی ناسیاویی و نەناسیاوی نیە •

حالەتی ڕێزمانی بەپێی مێژووی پێشکەوتنی زمان دەشێ گۆڕانی بەسەردا بێت ؛ بەلآم بە شێوەیێکی یەکجار سست‌و لەسەرخۆ • لەو بارەیەوە دەتوانین هەندێ نموونە بخەینە پێش چاو :

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا جنسەکانی ناو دەستووری‌کی ڕێك‌وپێکیان ڕەچاوکردووە و لە ڕێگەی نیشانەوە لە یەکتر جیادەبنەوە • لە دۆخی تیاندا جنسی مێ نیشانەی (ێ) وەردەگرێ‌و جنسی نێریش نیشانەی (ی)ی پێوە دەلکێ • لە بەشە دیالێکتی موکری و هەندێ ناوچەی سۆران و کەمێك لە دەور و پشتی سلێمانیدا ، هەرچەندە وەك دیالێکتی کرمانجی ژووروو ڕێك‌وپێك خۆیان نانوێنن ؛ بەلآم تا ڕادەیێك دەستووری خۆیان پاراستووە • لەم بەشە دیالێکتانەی خوارووشدا هەر نیشانەی (ێ) دەچێتە سەر ناوی جنسی مێ و هەر نیشانەی (ی)یش ئیزافەی سەر ناوی جنسی نێر دەبێ • لە زمانی ئەدەبی‌و ئاخاوتنی سلێمانی‌و هەندێ ناوچەی تردا نیشانەی نێرو مێ (جگە لە چەند حالەتێکی زۆر کەم نەبێ) نەماوە[18].

(18) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بروانە ( ل ١٦٧)ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە •

به پێچەوانەشەوە وا پێدەچێ حاڵەتی کۆی بە یارمەتی نیشانەی (ـ ات) سازبوو (باخات ، خەیالاَت ، ئاغاوات ، دێهات ...) ، دەبێ لە دەورێکەوە پەیدابووبێ و گەشەی سەندبێ ، کە کورد ئاینی پیرۆزی ئیسلامی وەرگرتبێ .

کەرەستەی دەرەکی دەربڕینی حالآتی ڕێزمانی لە زمانانی جیاوازدا وەك یەك نین و جیاوازن . ئەمەش : گیرەك (ئافیکس) ، بە یەکتر گۆڕینەوەی دەنگ ، هێز (النبره) ، تەرتیبی وشە ، ئاواز...دەگرێتەوە .

زمانی کوردی کەرەستەی گیرەکی زۆر تێدایە و ئاشکرا دەبینرێ فۆرمی جۆربەجۆری بە یارمەتی پێشگر و پاشگری ڕێزمانی سازدەبێ[19] . بەوێنە تاك و کۆ ، ناسیاوی و نەناسیاوی ...بە هۆی نیشانەی کۆتایی (پاشگر)ەوە لێكجیادەبنەوە (کور - کوڕان ،شێر - شێران ، برا - برایان ... کوڕ - کوڕەکە - کوڕێك ، شێر - شێرەکە - شێرێك ، برا - براکە/برایەکە ، برایێك ...) . کرداری ڕابوردووی نزیك لە ڕابوردووی بەردەوام بە هۆی پێشگرەوە لەیەك جیادەکرێنەوە ، وەك : (چوو - دەچوو ، هات - دەهات ، نوست - دەنوست ... ).

بەیەکتر گۆڕینەوەی دەنگ ، کە یارمەتی دەربڕینی واتای ڕێزمانی بدات بە گیرەکی ناوەکی ناسراوە . گیرەکی ناوەکی ئەگەرچی لە زمانی کوردیدا کەمە ، بەلاَم لە هەندێ حاڵەتدا بەرچاو دەکەوێ ، ئەویش بە زۆری لە بەرانبەر یەکتر وەستانی کرداری تێنەپەڕ و تێپەڕدا ، وەك :

---

(19) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو دەربارەی دەوری پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

آ ـ د : بڕان ـ بردن

کران ـ کردن

آ ـ ی : دڕان ـ دڕین

بـڕان ـ بـڕین

گۆڕان ـ گۆڕین

ە ـ یَ : گـەڕان ـ گێـڕان

... هتـــد .

هێز لە زمانی کوردیدا ، کە لـە شوێنێکـەوە دەگـوێزرێتـەوە بـۆ شوێنێکی دی ، جگە لەوەی دەبێتە هـۆی جیـاوازیی واتـا ، هـەروەهـا دەبێتە هۆی ڕاگەیاندنی حاڵەتی ڕێزمانیی جیاوازیش ـ واتە لەتەك دەوری دەنگسـازیدا ، دەوری ڕێـزمـانیش دەبینێ . بـۆ نمـوونـە ، وشـەی (کۆبـوونـەوە) ئـەگـەر هێـز لـەسـەر بـڕگـەی یـەکـەم دابنـرێ ، ئەوە دەبێتە کرداری ڕابوردووی کۆی کەسی سێیەم و مانای (اجتمعـوا)ی عەرەبی بە دەستەوە دەدات . خۆ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دوا بڕگـە ، ئـەوە دەبێتە چاوگ و مانای (الاجتماع)ی عەرەبی دەبەخشی[20] .

کاتێ تەرتیبی وشە واتای ڕێزمانی ڕادەگەیەنێ ، کە دەوری وشـە لـە ڕستەدا بە هۆی شوێنی لەناو وشەکانی دییەوە دیاری بکـرێ و گـۆڕینی تەرتیبی وشەکان ئەرکی ڕێزمانیی وشەکان بگۆڕێ . بۆ نموونە ، ئەگەر لە دوو ڕستەی : ( ١ ـ من ئازادم برد بۆ سەیران ، ٢ ـ ئازاد منی بـرد بـۆ سەیران )دا بەراورد لە نێوان وشـەی (من) و (ئـازاد)دا بکـەین ، دەبینین کە لە ڕستەی یەکەمدا (من) لە دۆخی ڕاستـەوخۆدایـە و هیچ جێنـاوێکی

(٢٠) بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧٣

لکاوی وەرنەگرتووە . هەرچی (ئـازاد)ە لـە دۆخی تیـاندایـە و جێنـاوی لکاوی کەسی یـەکەمی تاك ـ (م)ی چووەتـە سـەر . بـەلام لـە ڕستـەی دووەمدا هۆی گۆڕینی تەرتیبی ئەو دوا وشەیە ـ (من) و (ئازاد) ـ بـووە بە هۆی گۆڕینی حالەتی ڕێزمانی‌یان . لێرەدا بەپێچەوانەوە (ئازاد) لەدۆخی ڕاستەوخۆدایە و (من)یش لـە دۆخی تیـانـدا . (مـن) جێنـاوی لکـاوی وەرگرتووە ، نەك (ئازاد) .

هەروەها ئاوازیش دەتوانێ وەسیلەی دەربـڕینی واتـای ڕێـزمـانی بێت . بۆ نموونـە : «شیـرین گـەڕایـەوە»و «شیـرین گـەڕایـەوە ؟ »، ڕاگەیاندنی هەواڵی گەڕانەوەی شیرین و پرسیارکردنی گەڕانەوەی شیرین پێکەوە بەیەك ڕێژەی کردار دەردەبڕدرێ ، کە ئەویش «گەڕایـەوە»یـە .

ئەگەر گیرەك و بەیەکتر گۆڕینەوەی دەنگ‌و هێزی وشـە و ئـاواز تەنیا وەك وەسیلەی دەربڕینی حالەتی ڕێزمانی خۆیـان بنـوێنن‌و واتـای نەڕەتیی وشە نەگۆڕن ، ئەوە ئەم وەسیلانە ، کە شێوەی جیـاوازی وشـە سازدەکەن بە (قالبی وشە) ناودەبرێن . قالبی وشە لە خزمـەتی دەربـڕینی حالەتی ڕێزمانیی جۆربەجۆردایە و جیاوازیی هەر یەکێکیان لـەوی دی ، لەوەدایە کە بە کام حالەت دەربڕراوە و وەك ناوە بـەپێی حـالـەتـەکـەی ناونراوە[21] . بەوێنە ناو فۆرمی تاك‌و کـۆ ـ (ژن ـ ژنـان)و ناسیاوی و نەناسیاوی ـ (ژنەکە ـ ژنێك) ...ی هەیە . کردار خاوەنی فۆرمی کەس ـ (دەچم ، دەچێت ...) و کات ـ (دەچم ـ چووم) و ڕێژە ـ (دەچم ـ بچم، بچوومایە...) . واتای لێکسیکیی وشە لە فۆرمی جیاوازیدا وەك خـۆی دەمێنێتەوە و ناگۆڕێ . هەموو فۆرمەکانی (ژن) هەر یەك واتا دەگەیەنن . گشت فۆرمەکانی کرداری (دەچم) ـ یەك ڕووداو . هەر فۆرمێکی وشـە ، هەر وەك حالەتی ڕێزمانی ، خاوەنی واتا و دەربڕینی دەرەکین .

(٢١) ن. س. پۆسپێلۆف ، پێوەندیی نێوان حالەتی ڕێزمانی و بەشەکانـی ئاخاوتن ، کتێبی «کێشـەی پێکهاتنی ڕێزمانـی » ، مۆسـکـو ، ١٩٥٥ ، ل ١٧٤ .

یەکێ لە ئەرکەکانی وشەسازی ، ئەوەیە کە لە پێکهاتنی ڕێزمانیی وشە دەکۆڵێتەوە وەك واتای ماکی ئاخاوتن ، کە پاریدەی واتای مەفهووم دەدا ، لە ڕووی واتاوە دانەیێکی سادە نییە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە وەك لە لێکدانەوەی حاڵاتی ڕێزمانیدا دەرکەوت ، گەلێ جار چەند واتاییێکی ڕێزمانی هەیە . لە ڕووی ئەم پێوەندییەوە ، گەلێ وشە دابەش دەبن بەسەر پارچەی واتاردا ، کە هەر یەکێکیان واتاییێکی تایبەتی هەڵدەگرێ[22] . بۆ نموونە ، لە وشەی (کارگەکان)دا پارچەی (کار) واتای ، ئیش و فرمان دەدات ، پارچەی (ـ گە) شوێن و جێگە نیشاندەدا ، پارچەی (ـ ەکە) ناسیاوی دەردەبڕێ ، پارچەی (ـ ان)یش کۆ ڕادەگەیەنێ . لە وشەی (کاداتێك)دا پارچەی (کا) لاسکی وشکەوەبووی گەنم و جۆ و شتی دی دەدات ، پارچەی (ـ دان) شوێن و جێگە نیشان دەدا ، پارچەی (ـێك) نەناسیاوی و تاکایەتی ڕادەگەیەنێ ... لە وشەی (داکوتانەوە) دا پارچەی (دا ـ) بزووتنەوەی بەرەوخوار نیشاندەدات ، پارچەی (کوتان) واتای لێدان لە شتێك ڕادەگەیەنێ ، (ـ ەوە) دووبارەبوونەوەی ڕوودان دەردەبڕێ . لە وشەی (وەرگێڕرا)دا پارچەی (وەر ـ) واتای هەڵگێڕانەوە دەدات ، پارچەی (گێڕ) کە ڕەگی (گێڕان)ە مانای هێنان و بردن دەگەیەنێ ، پارچەی (ـ ر) کارا بزرێتی دەردەبڕێ ، پارچەی (ـ ا) کاتی ڕابوردوو دەگەیەنێ ... ئەم پارچانەی وشە ، کە وا هەڵگری واتای لێکسیکی و ڕێزمانین ، پێیان دەوترێ (مۆرفێم) . مۆرفێمیش وەك وشە ، لە سەرێکەوە خاوەنی واتایە و لە سەرێکی دیەوە دەنگ و برێتییە لە بچووکترین دانەی واتاداری زمان .

---

(22) ل. بلومفیلد ، زمان (تەرجوومەی ڕووسی ) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ ، ل ٧٣

بچووکترین دانە ، کە لە پرۆسێسی لەیەکترگەیشتندا بەکاردێنرێ .
بریتییە لە وشە . وشە دەشێ هەندێ جار لە لایەن ئاخێوەرەوە سەربەخۆ و
تەنیا بەکاربهێنرێ . ئەمەش لە بارێکدا دەبێ، کە ڕستە لە وشەیەك پێك بێ :
(ئێوارێ ، لەسەرخۆ ...) یاخود کاتێ ڕستەکە بەتەواوی نەوترێ ، بە
وێنە لە وەڵامی پرسیاردا : (کەی ئێوە هاتن ؟ ـ دوێنێ ، کێتان
لەگەڵبوو ؟ ـ ئازاد) . مۆرفێم لە ئاخاوتندا بەجیا بەکارنایەت و تەنیا لە
وشەدا دەبینرێ و وشەش دابەش‌دەبێ بەسەر مۆرفێمدا .

بارودۆخی سەرەکیی دابەش‌کردنی وشە بەسەر مۆرفێمدا ، ئەوەیە
زنجیرە وشە خاوەنی یەکێتی پێکهاتنە ، کە وا لە یەکگرتنی هەمەجۆردا
گەلێ جار هەمان واتای لێکسیکی و ڕێزمانی بەرچاودەکەوێ . بۆ نموونە ،
لە وشەی (کچۆڵە)دا جیاکردنەوەی مۆرفێمی (کچ)و (ـ ۆڵە) بارودۆخی
وشەکانی (کچانە ، کچێنی ، کچانی ، کچێتی ...) ڕادەگەیەنێ ، کە
پارچەی (کچ)یان تێدایە و لە سەرێکی دیشەوە ، لە وشەکانی (نەرمۆڵە ،
شڕۆڵە ...)دا پارچەی (ـۆڵە) دەبینرێ .

هەر پارچەیێکی وشەی (هەڵگەڕاندنەوە) : (هەڵ ـ) ، (گەڕ) ،
(ـ ان) ، (ـ اندن) ، (ـ ەوە) لە چەندین وشەی دیدا بەدی‌دەکرێ :

| هەڵ ـ | گەڕ | ـ ان | ـ اندن | ـ ەوە |
|---|---|---|---|---|
| هەڵ ـ گەڕان | گەڕ ـ ان | شک ـ ان | نو ـ اندن | چوون ـەوە |
| هەڵـچوون | وەر ـ گەڕـان | ترس ـان | شلک ـان ـاندن | هاتن ـەوە |
| هەڵـواسین | لێ ـ گەڕـان | هێن ـان | دڕـان ـاندن | بردن ـەوە |

بەو پێیە وشەکانی زمان کەرەستەی دابەش‌کردنی وشەیە بەسەر
مۆرفێمدا . بوونی وشەیەکی زۆری گرووپی جۆربەجۆر لە سەرێکەوە

یاریدەی ئاخێوەر دەدات وشەکانی زمان بەسەر مۆرفێمدا دابەش بکا و لە سەرێکی دیشەوە بە ڕێگەی ئەو گرووپانەدا وشەی نوێ دروست بکا [٢٣].



لە بەرنامەی لێکۆلینەوەی زماندا شێوازی بەراوردکاری دەورێکی گەورە دەبینێ • دەتوانرێ بەراورکردن بۆ هێنانەدی دوو مەبەستی جیاواز بخرێتە کار : بۆ دۆزینەوەی یاسای گشتی یان دەستخستنی بەلگەی مێژوویی • زمانەوان پێویستی بە بەلگەی مێژووییە تا ڕووتر مێژووی پێشکەوتنی زمان یان خێزانی زمانی لەبەرچاوبێ • پێویستیی لێکۆلینەوەی مێژووی پێشکەوتنی زمان ، ئەو هەلوێستە بەناوبانگەی ف. ئێنگلس دیاری دەکا ، کەوتوویە : «کەرەستە و قالبی زمانی زگماك تەنیا بە ئاگاداری و وردبوونەوە لە پەیدابوونی و پێشکەوتنی لەسەرخۆی پلە بە پلەی ، ڕوون و ئاشکرا دەبێ • دەنا ئەگەر گرنگی بەوە نەدرێ ، ئەوە ناتوانرێ قالبە مردەکانی ئەو زمانە و زمانە مردوو و زیندووەکانی هاوڕەگەزی بزانرێ »[٢٤].

لە بەراوردکردنی زماندا بە ئاسانی هەست بە وێکچوون دەکرێ • کوردێك ئەگەر تەنیا هەر زمانەکەی خۆشی بزانێ ، بێ گیروگرفت تێدەگا، کە (چەهار)ی فارسیی ناوەڕاست و (چهار)ی فارسیی نوێ و (چار)ی بلووجی ، واتای (چوار)ی کوردی دەگەیەنێ • بەلام بەرانبەر یەکتر ڕاگرتنی زمانانی دوور لەیەك یان کۆن و نوێ وا ڕوون و ئاشکرا

---

(٢٣) سەرچاوەی ناوبراو ، ئا. ن. گۆزدیێڤ ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمرۆ ، ل ١١٨ .

(٢٤) ف. ئێنگلس ، کارە کۆکراوەکانی ، چاپی دووەم ، بەرگی بیستەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٣٣٣ .

دەرناکەوێ . ئەگەر لە دوو زمانی لەیەکتر دوورەوە هەندێ وشە وەك یەك بن ، ئەوە ئەو جۆرە وێکچوونە بۆ لێکۆڵینەوە بایەخی نی‌یە . وێکچوونی ڕێکەوت و چەند شتێکی لابەلا ناچنە نێو کاری واقیعی و زانستی‌یەوە . لەبەر ئەوەی هەر بەڵگە و ڕاستی‌یێکی زمان سەر بە سەرپاکی زمانە،بۆیە دەبێ لەباری دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی و واتاناسی‌یەوە سیستەمی زمانێك لەگەڵ سیستەمی زمانێکی دیدا بەرانبەر یەك ڕابگیرێن ، بەو مەبەستەی نیشانبدرێ ، کە ئەو زمانانەی بەراوردکراون ، خزمایەتی لە نێوانیاندا هەیە یان نا و ئەگەر هەیە ، بزانرێ ڕادەی خزمایەتی‌یەکە چەندە .

گەلێ جاریش وێکچوون دەبینرێ ، کە ڕاست نی‌یە بەوە دابنرێ ، گوایا زمانێك لە زمانێکی دیی‌ەوەی وەرگرتبێ ، بەڵکو ڕاستی ئەوەیە ، سروشتی پێوەندیی بەردەوامی نێو زمانانی خێزانێك ئەمەی سازکردووە . گرووپی زمانانی هاوڕەگەز ، بەو کۆمەڵە زمانە دەوترێ ، کە لە نێوانیاندا وێکچوونی سروشتی لە پێکهاتنی دەنگ و واتای ڕەگی وشەو گیرەك (ئافیکس)دا دەردەکەوێ . ڕوونکردنەوە و دیاری‌کردنی ئەو وێکچوونە سروشتی‌یەی لە نێوان زمانانی هاوڕەگەزدا هەیە ، ئەرکی لێکۆڵینەوەی بەراوردیی مێژوویی‌یە[25] .

جێگەی دیار لە لێکۆڵینەوەی بەراوردیی مێژوویی‌دا دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی بەراوردە مێژووییەکە . ئەو شێوازەش کە وەك سیستەمی توێژینەوەی زانستی دیاری‌دەکرێ ، لە لێدوانی زمانانی خێزانێکدا

---

(٢٥) ف. م. بیریزین ، ب. ن. گولوڤین ، زمانناسیی گشتی ، مۆسکو ، ١٩٧٩ ، ل ٢٩٧ .

بەگاردێنرێ بو یتە ندانی وێنەی مێژوری کۆنی ئەو زمانانە بە مەبەستی والاکردنەوەی سروشت و پێشکەوتنیان • ئەمەش دەبێ لەو زمانەوە دەست پێبکات ، لە بنەمای ئەو زمانەیە و ئەو خێزانەی لێکەوتووەتەوە .

شێوازی بەراوردیی مێژوویی لەسەر بناغەی ژمارەیێك خواست و پێویستی ڕۆدەنرێ ، تا ئەنجامی باش وەدەست بهێنرێ :

١ ـ لە بەراوردکردنی وشە و قاڵبی وشەدا لە زمانانی خێزانێکدا پتر گرنگی بە قاڵبی کۆن و دێرین دەدرێ • زمان بریتییە لە یەکێتییێکی بەشی کۆن و بەشی نوێ ، کە لە کاتی جیاوازدا پەیدابوون • لە ڕەگی ئاوەڵکرداری (ئێرە)ی کوردیدا ، پاشماوەی کۆنی وشەی(ئرە)ی ئاوێستاو (ئێتەر)ی فارسیی ناوەڕاست دەبینرێ • یاخود (هەمیشە ، هەموو دەم)ی کوردی و (همدە)ی ئاوێستا •••

٢ ـ وردبوونەوەی تەواو لە یاساکانی دەنگسازی ، بەتایبەتی لەو ڕووەوە ، کە لە دۆخێکی دیاریکراودا دەنگێك تێدا دەچێت ، یان دەگۆڕرێ بە دەنگێکی دی • بۆ نموونە «هەفتات ، ئەشتات/هەشتات»ی زمانی فارسیی ناوەڕاست لە زمانی فارسیی نوێ و زمانی بلووجیدا (ت)ەکە بووە بە (د) ـ «هەفتا ، هەشتا» و لە زمانی کوردیشدا (ت) تێداچووە و (ا) ماوەتەوە وشەکان بوون بە «حەفتا ، هەشتا» •

٣ ـ وێکچوونی هەندێ حاڵەتی ڕێزمانیی زمانی کوردی لەگەڵ زمانانی هاوخێزانیدا شتێکی ڕێکەوت نییە • بۆ نموونە ، لە ئاوێستادا ناوی نێری بە (ە) کۆتایی هاتوو ، بەرانبەر بە ناوی مێی بە (ا) کۆتایی هاتوو دەوەستا • ئەوەتە وشەی «ئەسپە» ـ (ئەسپ) جنسی نێرە و بەرانبەری «ئەسپا» ـ (ماین) هەیە ، کە جنسی مێینە • وا پێدەچێ

(ا)ی نیشانەی جنسی مێی حاڵەتی ئیزافەی دیالێکتی ژووروویی کوردی لەو (ا)یەی نیشانەی جنسی مێیەی حاڵەتی ئاسانی ئاوێستاوە مابێتەوە ، کە لە سەرەوە پەنجەمان بۆ ڕاکێشاوە •

٤ ـ لە مەسەلەی وشەڕۆناندا وێکچوونی گەلێ پێشگر و پاشگر بەڵگەی هاوڕەگەزێتین • بۆ نموونە پاشگری (ـ دان ، ـ گەر •••) بە هەمان شێوە لە فارسیی ناوەڕاستدا دەبینرێ ••• پاشگری (ـ وان/ەوان، ـ گا/گە•••)ی کوردی لە فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی نزیکی (پان ، گاس•••)دا هەیە •

••• هتد •

ماوەیەکە هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی تا ڕادەیێك بایەخ بەو جۆرە بەراوردکاری‌یە مێژووییانە و هەندی شێوازی دی دەدەن ، بەڵام ئەوەی کە تا ئێستا ئاوڕی لێنەدراوەتەوە،یاخود کەم لای لێکراوەتەوە،دوو مەیدانی ڕستەسازی و واتای کۆنی وشەن لە شێوازی بەراوردکاریی مێژووییدا • لە ڕاستیشدا کێشەی بەراوردکاریی ئەو دوو بوارە ، ئەگەرچی کارێکی یەکجار گرانە ، بەڵام لە مەیدانی بەراوردکاری‌دا ، باسی گرنگ و سەرەکین •

لەکۆتاییدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشین ، کە ئا• مایبە تەواو نیشانی پێکاوە، کە وتوویە : «بەراورد تاکە وەسیلەی ڕێخۆشکەری تۆژەرە بۆ بیناکردنی مێژووی زمان»[٣٦] • منیش لەبەر ڕووناکیی ئەو بیرە وردەدا لەم بەرهەمەدا ، بەپێی توانست هەندێ بەراوردی مێژوویم کردووە و ئەگەر کەڵکێکی بێ ، خۆم بە بەختەوەر دەزانم •

د• ئەورەحمانی حاجی مارف

---

(٣٦) ئا• مایبە ، شێوازی بەراوردکاری لە زمانناسیی مێژووییدا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٤ ، ل ١٨ •

# کورتە هەڵسەنگاندنێکی
# ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی
# « ژمارە »دا کراون

مامۆستا سەعید صدقی کابان لە کتێبی «مختصر صرف و نحوی کوردی»دا (ژمارە)ی لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا باس کردووە و بە جۆرێك لە جۆرەکانی ناوی لەقەڵەم داوە [1].

لەم بەرهەمەدا چوار جۆر ژمارە جیاکراوەتەوە : « ١ ـ ژمارەی ئەصلی ، ٢ ـ ژمارەی ڕوتبەیی ، ٣ ـ ژمارەی تەوزیعی ، ٤ ـ ژمارەی کەسری » ( ل ١٢ ) .

لە باسی ژمارەی بنجیدا ، کە ئەو «ژمارەی ئەصلی» پێوتووە، تەنیا ناوی چەند ژمارەیێکی نووسیوە و ئەوەی وتووە ، کە لە (یەك)ەوە تا (دە) ـ (یەکان) ، لە (دە)ەوە تا (سەد) ـ (دەیان) ، لە (سەد)ەوە تا (هەزار) (سەدان) ، لە (هەزار)ەوە تا (ملیۆن) ـ (هەزاران)یان پێ دەڵێن (ل ١٣) .. ئیتر هیچ تایبەتێتییەکی دی باس نەکردووە ، واتە ـ نە لە ڕووی ڕۆنانیانەوە نە لە ڕووی بەکارهێنانیانەوە ، نە لە ڕووی پەیدابوونیانەوە ... نەدواوە [2].

دەربارەی ژمارەی پلەیی، کە ئەو بە «ژمارەی ڕوتبەیی» ناوی بردووە، هەر ئەوەندەی باس کردووە ، کە بە خستنەسەری ( ـەم ) ، ( ـەمین ) بۆ سەر ژمارەی بنجی پێكدێ (ل١٣) .

---

(١) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل ١٢ ـ ١٣ .

(٢) دواتر ئەو کێشانە ڕووندەکەینەوە .

باسی ژمارەی کەرتی - واتە (ژمارەی کەسری)یش بریتییە لە پێناسەیێکی کورت و چوار نموونە .

وشەکانی وەك «یەکیەك ، دوودوو ، چوارچوار ...» ، کە مامۆستا سەعید صدقی و زوربەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بە ژمارەی دابەش - «ژمارەی تەوزیعی» دایانناوە جێی سەرنج و دەمەتەقێیە ، چونکە ئەگەرچی ئەو جۆرە وشانە لە دووپاتکردنەوەی ژمارەی بنجی پێكدێن ، بەڵام لە ئەنجامدا دەبنە ئاوەڵکردار و ڕاست نییە بە ژمارە دابنرێن .

لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»دا ، مامۆستا تۆفیق وەهبی بەشە ئاخاوتنی ژمارەی بە جۆرێکی ئاوەڵناو داناوە و لەژێر سەرباسی «سیفەتی ژمارەیی»دا لێی کۆڵیوەتەوە [٣].

نووسەری ئەم کتێبە لە سەرەتادا ژمارەی بەسەر دوو جۆردا دابەشکردووە و وتوویە : «سیفەتی ژمارەیی دوو چەشنی هەیە : ١ - سیفەتی ژمارەیی ئەسڵی ، ٢ - سیفەتی ژمارەیی ڕوتبەیی» (ل ٧٤) ، کەچی کە لە باسی ژمارەی بنجی و ژمارەی پلەیی بووەتەوە لە لاپەڕە (٧٦)دا بەناوی « ژمارەی کەسری »یەوە لە ژمارەی کەرتی دواوە . بەم پێیە لەم بەرهەمەدا سێ جۆر ژمارە : (١ - بنجی ، ٢ - پلەیی ٣ - کەرتی ) باسکراوە . دیارە نەیبینینی باسێك بەناوی (ژمارەی تەوزیعی) یەوە ، ئەوە دەگەیەنێ مامۆستا وەهبی دەرکی بەوە کردبێ ، کە وشەکانی (یەکیەك ، دوودوو ، سێسێ ... ) ژمارە نەبن :

---

(٣) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ٧٤ - ٧٧ .

باسی ژمارەی بنجی ، کە ئەو «سیفەتی ژمارەیی ئەسلی»ی پێوتووە، بە پێناسەیەك دەستپێکردووە و یەكدوو نموونەی بۆ هێناوەتەوە . لە باسی تایبەتیتییەکانیشدا تەنیا لە دوو خاڵ دواوەو ئەویش بە چەند دێڕێك . دوو خاڵەکەش ئەمانەن :

أ ـ هاتنی لە پێش ناوەوە و مانەوەی ناوەکە لە شێوەی تاکدا .

ب ـ «ئەگەر ناوەکە بە ناو تەواو کرابێ ژمارەی هەر کامێکیان گەرەك بێ سیفەتی ژمارەیی ئەسلی ئەخرێتە پێش ئەوناوەوە»(ل ٧٤ ـ ٧٥).

لەمە زیاتر هیچی دی باس نەکردووە ، لەگەڵ ئەوەدا کە ژمارەی بنجی لەگەڵێ ڕووەوە سەرنجی تۆژەر ڕادەکێشێ و بواری باسکردنی یەکجار فراوانە .

نووسەری کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» لە باسی ژمارەی پلەییدا ، ئەوەی یادداشتکردووە ، کە ئەگەر ژمارەی بنجی کۆتایی بە دەنگی (ۆ ، ێ) بێت ، ئەوە (ی)یەك لە نێوان ژمارە بنجییەکە و نیشانەکەدا پەیدا دەبێ ... ڕاستە ئەو (ی ـ y ) نیمچەبزوێنە یاریدەی پێوەلکانی نیشانەی ( ـ ەم ، ـ ەمین ) دەدا بە ژمارەی کۆتایی هاتوو بە دەنگی ( ۆ ، ێ )یەوە ، بەڵام پێویستە ئەو ڕاستییەش لەبیرنەکەین ، کە ( ی ـ y ) نیمچەبزوێن بە هەمان شێوە لەگەڵ ئەو ژمارانەشدا پەیدا دەبێ ، کە کۆتاییان بەدەنگی ( ا ، و ، ی ) دێت ... وێڕای ئەوە ، ئەوەشی باسنەکردووە ، کە ئەگەر ژمارە بنجییەکە کۆتایی بە دەنگی (وو) بێت ، نیمچەبزوێنی (و ـ w ) یاریدەدەدا .

مامۆستا وەهبی لە باسی ژمارەی کەرتیدا باش بۆ ئەوە چووە ، کە وشەکانی (سێیەك ، چواریەك ...) وشەی لێکدراون و ئەم جۆرە (پێکهاتنەش تەنیا لەو ژمارانەدا ڕەنگدەداتەوە ، کە ژمارەی دووەمیان

(یەك) بێت ... بەڵام ئەگەر ژمارەی دووەم ژمارەی (یەك) نەبێت ئەوە ژمارە کارێکی ... وەك وشەیەکی لێکدراو پەیدانابێ (ل ٧٦) ... بەڵام ئەوە جێی سەرنجە ، کە وشەی «نیو»ی بە ژمارەی بنجی دانـاوە و وشەی «نیوە»یش بە ژمارەی کەرتی (ل٧٧) . وەك دەزانین «نیـو» و «نیوە» هەردووکیان لە دوو بەش بەشێك ڕادەگەیەنن . بۆ نموونە چۆن دەشێ بوترێ «منداڵەکە نیو سێوی خوارد» ، بە هەمان چەشن دەلـوێ بوترێ «منداڵەکە نیوەی سێوەکەی خوارد » ... جا باس ئەوە نی‌یە «نیو» ژمارەی بنجی بێت و «نیوە»یش کەرتی ، بەڵکو باس ئەوەیە «نیو» شتی (مطلق ، تجرید ) ڕادەگەیەنێ و «نیوە»یش (مجسم ، محدود) .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لەو کتێبەیدا کە بە نـاوی «ڕێزمـانی کوردی»یەوە بڵاوی کردووەتەوە[٤] ، لە سەرێکەوە پەیرەوی مـامۆستـا تۆفیق وەهبی کردووە و وەك ئەو ژمارەی بە جۆرێکی ئاوەڵناو دانـاوە . لە سەرێکی دی‌یەوە لە دابەش‌کردنی‌دا بە ڕێگەی مامۆستا سەعید صدقی‌دا ڕۆیشتووە و وەك ئەو چوار جۆری (١ ـ ژمارەی ڕیشەیی ، ٢ ـ ژماری تەرتیبی ، ٣ ـ ژمارە تەوزیعی ، ٤ ـ ژمارەی کەسری ) دیاری کردووە ...

نووسەری کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» و نووسەری کتێبی «ڕێزمانی کوردی» بەپێی پەیرەوی کردنی نووسەرانی ڕێزمانی ئینگلیزی ژمارەیان بە ئاوەڵناو داناوە . ڕاستە لە زمانی ئینگلیزیدا لە یەکەم سەرنجدا ڕەنگە وا بێتە پێش‌چاو، کە هاتنی ژمارە لەگەڵ ناودا وەك« two boys- دوو کوڕ» جیاوازی لەگەڵ هاتنی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا « little boys ـ کوڕی بچووك» نەبێ ... بەڵام ئەگەر قووڵ لەو مەسەلەیە وردبیینەوە

(٤) نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٣٢ ـ ١٣٧ .

بە ئاسانی هەست بەوە دەکەین ، کە لە نێوان ژمارە و ئاوەڵناودا جیاوازی زۆرە . ئەو جیاوازی‌یەش بە ڕوونی لە پێوەندیی واتای پارچەکانی ژمارەی پێکەوەبەستراو و پێوەندیی واتای پارچەکانی ئاوەڵناوی پێکەوەبەستراودا بەدەردەکەوێ .

وەك ئاشکرایە ، بۆ پێکهێنانی ئەو جۆرە ژمارانە ،دوو ڕێگەی (کۆکردنەوە) و (لێکدان) باون . بەڵام هەرچی پێوەندیی واتای پارچەکانی ئاوەڵناوی پێکەوەبەستراوە ، لەسەر بناغەی ئەو دوو ڕێگەیە سازناکرێت . بەوێنە کە دەوترێ (شینی کاڵ) هیچ ئەوە ناگەیەنێ ، کە لە (شین + کاڵ) یاخود (شین × کاڵ) پێکهاتبێ ... جا برێ لە نووسەرانی ڕێزمانی ئینگلیزی ڕاست نین ، کە ژمارەیان خستووەتە نێو بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوەوە . هەرچی هەندێ نووسەری ڕێزمانی کوردی‌یشە ، کە لاسایی زمانی ئینگلیزی‌یان کردووەتەوە ، ئەگەر گوێ نەدەینە دەرك نەکردنیان بەو جیاوازییانەی لە زمانی ئینگلیزی و زۆر زمانی دی‌دا لە نێوان ژمارەو ئاوەڵناودا هەیە ، کە بەشێکیمان لە سەرەوە باس‌کرد ، خۆ دەبوو هەست بەوە بکەن ، کە لە ڕستەی کوردیدا ئاوەڵناو بەدوا ناودا دێت : (ژنی جوان) ... بەڵام هەرچی ژمارەیە دەکەوێتە پێش ناو : (چوار ژن)..

لەو ڕووەشەوە ، کە مامۆستا نووری عەلی ئەمین ، وەك مامۆستا سەعید صدقی ژمارەی کەرتی (ئەوان واتەلی - ژمارەی تەوزیعی) بە جۆرێك لە ژمارە داناوە ، ئەوە دووپات ناکەینەوە ، کە لە باسی کتێبی «مختصر صرف و نحوی کوردی»دا وتوومانە ، بەڵکو تەنیا ئەو ڕستەیە دەخەینە پێش چاو - «گوێزەکانم پێنج‌پێنج ژمارد» (ل ١٣٦) ، کە مامۆستا نووری عەلی ئەمین کردوویەتی‌یە بەڵگە، پێویست ناکا ئەوە ئیسپات‌بکەین کە «پێنج‌پێنج» وەسفی کرداری «ژمارد» دەکا چونکە نووسەر خۆی

دەڵێ : « پێنج‌پێنج ژمارەی تەوزیعی‌یە وەسفی کرداری (ژمارد) ئەکا » (ل ١٣٧) و دواتریش لە بەشی گاوەڵکرداردا ئەوەی دیاری‌کردووە ، کە ئەرکی یەکەمی گاوەڵکردار ، ئەوەیە وەسفی کردار بکا (ل ١٨٦) •

نووسەر لەژێر سەرناوی «ژمارەی ڕیشەیی»دا لە ژمارەی بنجی دواوە و باسەکەی بە پێناسەیەك دامەزراندووە ، کە دەڵێ : «ئەو ژمارەیەیە ، کە کەرتی تیانی‌یە ، وەك (یەك ، هەشت ، پەنجا ، دوو)»(ل١٣٣) ••• ناتەواوی هەرە دیاری ئەو پێناسەیە لەوەدایە ، کە مامۆستا نووری وای داناوە ژمارەی بنجی کەرتی تێدا نی‌یە ، کەچی تەنانەت بە سەرنجی سەرپێیی لە ژمارە بنجی‌یەکانی زمانی کوردی ، ئەوە دێتە بەرچاو ، کە زوربەی زۆری ئەو ژمارانە بەلای کەمەوە دوو کەرتیان تێدایە ••• ئەوەتە جگە لە (ژمارەی سادە) ، هەروەها (ژمارەی دارێژراو) و (ژمارەی لێکدراو) و (ژمارەی پێکەوەبەستراو)یش هەیە • بەوێنە ژمارەی وەك (حەفتا ، هەشتا•••) دارێژراون و لە مۆرفێمێکی ڕیشەیی‌و مۆرفێمێکی وشەدارێژ سازبوون ـ بە واتاییکی دی وشەیەکی سادە (حەفت، هەشت)و پاشگری (ـ ا) پێکهاتوون • هەرچی (ـ ا)شە (ـ ات)ی ئێرانی‌یە و لە کوردیدا (ت) تێداچووە ••• ژمارەی وەك (یازدە ، دوازدە ••• چواردە• نۆزدە)•••(دووسەد ••• چوارسەد ••• نۆسەد)یش، کە لێکدراون و لە دوو وشەی سادە ، یا بڵێین لە دوو مۆرفێم پێکهاتوون ، دوو جۆرن : ١ ـ بەشێکیان ، وەك (یازدە•••نۆزدە) گۆڕانی فۆنەتێکی‌یان بەسەردا هاتووە ٢ ـ بەشەکەی دی‌یان ، وەك (دووسەسەد•••نۆسەد) هیچ گۆڕانێکی فۆنەتیکی‌یان بەسەردا نەهاتووە • ژمارەی پێکەوەبەستراویش ، وەك (سەدو چوار ، سەد و بیست و حەوت •••) لە یەك‌کەوتنی چەند ژمارەیەك پێك‌دێن و بە یارمەتی (و)ی پێوەندی پێکەوە دەبەسترێن •

دوا بەدوای ئەو پێناسەیە ، باسی چەند تایبەتێتی‌یەکی کەمی ژمارەی ـجی کردووە و ئنجا لە ڕووی ڕۆنانەوە لێی دواوە و دەڵێ :

«ژمارەی ڕیشەیی دوو بابەتە :

١ ـ ژمارەی سادە . ئەمیش دوو بەشە :

أ ـ بەشێکیان لە (١)ەوە دەست پێ ئەکا هەتا(٩) وەك (یەك، دوو، سێ، چوار ، پێنج ، شەش ، حەوت ، هەشت ، نۆ .

ب ـ بەشێکیشیان سەرگرێن (عقدە) وەك :

(دە، بیست، سی، چل، پەنجا، شەست، حەفتا، هەشتا، نەوەد، سەد، هەزار)» (ل ١٣٤)

بەشی(أ) تەنیا ئەوانە ناگرێتەوە کە لە (١)ەوە دەست پێ دەکەن هەتا(٩)، بەڵکو گەلێ ژمارەی دیش دەگرێتەوە ، وەك (دە) ، (سی) ، (چل) ، (سەد) (هەزار) ... و ئەمانیش هەر سادەن .

ژمارەیێکی زۆری بەشی (ب) ، وەك (دە) ، (سی) ، (چل) ، (سـەد) (هەزار) ... سەر گرێ (عقدە) نین و سادەی تەواون .

ژمارەکانی (پەنجا ، حەفتا....) ش دارێژراون ...

نووسەر لە باسی جۆری دووەمدا دەڵێ :

«٢ ـ ژمارەی لێکدراو . ئەمیش دوو بەشە :

أ ـ ژمارەی ئاوێتەیی . ئەوانەن کە لە دوو ڕیشەی تێکەڵاو بـەیەکتر پێك‌هاتوون ، کە لە (١١)ەوە دەست پێ ئەکا هەتا (١٩)

یانزە ، دوانزە ، ... پانزە ...

ب ـ ژمارەی پێ‌بەستی . ئەوانـەن کە لـە دوو ڕیشـە پێك‌دێن ، وە ئامرازی (و) ئەخرێتە بەینیانەوە ، بۆ ئەوەی کە بە یەکیانەوە گـرێ بـدا ، وەك : بیست‌وچوار.... هەشتاوهەشت » (ل ١٣٤ ـ ١٣٥) .

لێرەدا وێڕای ئەوەی ناوی هەندێ ژمارەی بە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی تۆمارکردووە ، ناوی ژمارەی وەك (دووسەد ، سێسەد ... نۆسەد)یشی نەبردووە و نیشانی نەداوە ، کە ئەمانە سەر بە چ جۆرێکن .

لە لاپەڕە (١٣٥ - ١٣٦)یشدا بە ناوی «ژمارەی تەرتیبی» یەوە لە ژمارەی پلەیی دواوە . ناتەواویی گەورەی ئەم باسە ئەوەیە ، نووسەر وای داناوە ، کە جگە لە ( ـ ەم ، ـ ەمین) ؛ ( یەم ، یەمین) و ( ـ هەم ، هەمین)یشی بە نیشانەی سازکردنی ژمارەی پلەیی داناوە ... وەك ئاشکرایە ، ئەو (ی)یە یان ئەو (ە)ە لەگەڵ ئەسڵی نیشانەکەدا نین . (ی - y )ی نیمچەبزوێن و (ە)ی نەبزوێن بۆ نەهێشتنی گرفتو ئاسانکردنی دەربڕین دێنە ناوانەوە ... پێویستە ئەوەش بڵێین ، ئەگەر ژمارە بنجییەک کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت ، ئەوە وەك بزوێنەکانی دی نیمچەبزوێنی (ی - y ) یاریدە نادا ، بەڵکو نیمچەبزوێنی (و - w ) ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ ...[5] سەرەڕای ئەوەش مامۆستا نووری ئەو نیشانانەی بە پاشگر داناوە ، بەڵام لە ڕاستیدا نیشانەن ...

لە نێو جۆرەکانی پێکهاتنی ژمارەی کەرتیدا ، نووسەر تەنیا باسی جۆری (چواریەك ، هەشتیەك ...)ی کردووە و ناوی ئەوانی دی : ١ - بە یارمەتیی پێشبەندی (لە) ، وەك : لە دە پێنج ... لە دەیان پێنج .. لە دەدا پێنج ... پێنج لە دە ... یەك لە چلان ... ٢ - بە هاریکاریی وشەی (لەسەر) ، وەك : دوو لەسەر پێنج ... ، ٣ - بە یارمەتیی نیشانەی ئیزافەی (ی) ، وەك : سەدی هەشت ، سەدی ... هتد[6] نەبردووە .

---

(٥) بۆ لێکۆڵینەوەی تەواوی ئەو کێشەیە ، بڕوانە : ئەو باسەی لەم کتێبەدا لە بارەی (ژمارەی پلەیی)یەوە کراوە ، ل ٨٨ - ١٠١ .

(٦) بڕوانە : ئەو باسەی لەم کتێبەدا دەربارەی (ژمارەی کەرتی)کراوە ل ١٠١ - ١٠٨ .

له باسی ژمارەی کتیبی«اوا ئو دەستورا زمانێ کوردی»ی مامۆستا جگه خوێندا[٧] ، باسی چوار جۆر ژماره : (١ ـ ژمارەی بنجی ، که ئەو «ژمارەی بنگهی»ی پێوتووه ؛ ٢ ـ ژمارەی پلەیی ، که به «ژمارەی ڕوتبی»ی ناوبردووه ؛ ٣ ـ ژمارەی دابەش ، که ئەو ناوی ناوی «ژمارەی پشکی» ؛ ٤ ـ ژمارەی کەرتی ، که ئەو به ناوی «ژمارەی شکەستی»یەوه لێیدواوه) .

لەم بەرهەمەدا سەرەڕای ئەوەی ژماره به جۆرێك له ناو دانراوه ، هەروەها ناتەواوی و هەڵەیەکی زۆر و تێکەڵکردنێکی نەشارەزایانە بەرچاو دەکەوێ .

کەم و کورتی و ناتەواوی باسی ژمارەی کتێبی «سەرەتایێك له فیلۆلۆژیی زمانی کوردی»[٨]ی مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لەچەند خاڵێکدا کۆدەکەینەوه :

١ ـ پێناسەی ژماره به جۆرێکی وا ساکار و نارێك کراوه ـ «هەر یەکێ ، له هەر ژمارەیێ ، که تۆ بتەوێ ناوێکی تایبەتی بەسەردا سەپێنراوه ...» (ل ١٧٦) ، که نه له پێناسه دەچێ و نه پێوەندی به پێناسەوه هەیه .

٢ ـ له دابەشکردنی ژمارەدا، که چوار جۆر ـ «١ ـ ژمارەی ساده ؛ ٢ ـ ژمارەی لێکدراو ؛ ٣ ـ کەرتی ژماره ؛ ٤ ـ ژمارەی ڕیزی»

---

(٧) جگرخوێن ، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٣٢ ـ ٣٥ .

(٨) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك له فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٧ ـ ١٦٩ .

(ل ١٦٧ ــ ١٨٦) دیاریکراوە ، ڕووی ڕۆنان و واتا تێکەڵ کراوە ، چونکە دوو جۆری یەکەم : (١ ــ سادە ؛ ٢ ــ لێکدراو) لـە ڕووی ڕۆنانەوەیە و هەرچی دوو جۆرەکـەی دیشـە : (٣ ــ کـەرتی ؛ ٤ ــ ڕیزی) لـە ڕووی واتاوەیە ••• سەرەڕای ئەوە لـە ڕووی ڕۆنـانـەوە جگـە لـە (سـادە) و (لێکـدراو) ؛ (داڕێـژراو) و (پێکەوەبـەستراو)یش هەیـە • لـە ڕووی واتاشەوە وێڕای (کەرتی) و (ڕیزی) ؛(بنجی)یش هەیە •

٣ ــ لە باسی دەوری ژمارە لە ڕستەدا ئەو هەڵەیە کراوە ، کـە ژمـارە بە ئاوەڵناو دانراوە و ئاوەڵناویش بە ناو •••

••• و هـەنـدێـکـی دی

هەرچی لایەنی بـاشی ئـەم کارەشە ، بـەتـایبـەتی لـە دوو خـاڵـدا بـەدەردەکـەوێ :

١ ــ ژمارە وەك بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ تەماشاکراوە •

٢ ــ وشـەی وەك (یـەكـیـەك ، دوودوو •••) بـە ژمـارەی دابەش دانەڕاوە •

مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە کتێبی «ڕێزمانی کـوردی»دا[9] چـوار جـۆر ژمـارە : (١ ــ ژمارەی بنـجی ؛ ٢ ــ ژمارەی پلەیی ؛ ٣ ــ ژمارەی کەرتی ؛ ٤ ــ ژمارەی دابەش)ی جیاکردۆتەوە و ژمارەی پلەیی بە ئاوەڵناو داناوە و سێ جۆرەکەی دیش بە ناو •

ئەم نووسەرەش بە هەڵە چووە ، کە وەك مامۆستایان : سەعید صدقی کابان و نووریَ عەلی ئەمین ، وشەکانی (یەكیەك ، دوودوو •••دەدە•••)ی بە جۆرێك لە ژمارە داناوە[10]•••

---

(٩) ئەحمەد حەسـەن ئەحمـەد ، ڕێزمانـی کـوردی ، بەغـدا ، ١٩٧٦ ، ل ١١٠ ــ ١٣٠ •

(١٠) لە باسی کتێبی «ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا نووری عـەلی ئەمینـدا وەڵامی ئەو بۆچوونەمان داوەتەوە • بڕوانە : لاپەڕە (٣١ ــ ٣٢)ی ئەم کتێبە •

خاوەنی کتێبی «ڕێزمانی کوردی» ، کە ژمارەی پلەیی بە ئاوەڵناو دانەناوە . دەبوو لە باسی ئاوەڵناودا لێی بدوێ ... ژمارەی بنچی و ژمارەی ئەرتی‌یش ناو نین و دوو جۆری ئەو بەشە ئاخاوتنە سەربەخۆیانە ن بە ناوی (بەشە ئاخاوتنی ژمارە)وە ناسراوە[11] .

نووسەر ئەگەرچی باسی هەندێ تایبەتێتی ژمارەی بنچی کردووە ، بەڵام بەشێکی زۆریانی بە هاسانی باس کردووە و هەروەها گەلێ تایبەتێتی گرنگی دی هەیە ناوی نەبردوون ... ئەوەی پتر سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەشە ، کە زوربەی لێدوانەکانی ئەم باسەی پتر پێوەندی بە پیرلانێ یاوە هەیەو بە دەگمەن گێشەی باسە بنەڕەتی‌یەکە کراوەتە کەرەستە .

لەبەر ئەوەی لە سەرەتادا بە هەلە نیشانەکانی (لە ئەو ئەناوانە) پێوتوونی ژمارەی پلەیی بە(ـ م ، ـ مین) داناوە ، بۆیە دواتر لەبەردەوامی باسەکەیدا دەکەوێتە هەڵەی گەورەترەوە ... ئەوەتە وای بۆ چووە ، ئەگەر ژمارە بنچی‌یەکە کۆتایی بە نەبزوێن بێت ، ئەوە لە نێوان نیشانەکە و ژمارە بنچی‌یەکەدا (ە) پەیدا دەبێ ... خۆ ئێستو کۆتایی بە بزوێنیش هاتبێ ، ئەو دەمە (یە) لەجیاتی (ە) دێت ... لە گەلێ شوێندا باسی ئەو جۆرە تایبەتێتی‌یانەی زمانی کوردیمان کردووە ، بۆیە بە کورتی دەڵێین ئەمە لەگەڵ هیچ یاسا و دەستوورێکی فۆنەتیکی زمانی کوردیدا ناگونجێ .

لە لاپەڕە (١٩ ـ ٣١)ی کتێبی پۆلی چوارەمی ئامادەیی[12] بەناوی ئاوەڵناوی ژمارەیی‌یەوە ، سێ باس دەبینرێ : (١ ـ ئاوەڵناوی

(١١) بۆ شی‌کردنەوە و لێکدانەوەی ئەو باسە ، بڕوانە : سەرەتای فەسڵی دووەمی ئەم کتێبە (ل ٥٤ ـ ٦١) .

(١٢) عەبدوڵڵا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی‌ئەمین، فەرەیدوون عەلی‌ئەمین، عەلائەددین سەجادی، د. ال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سەندی ، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٩ ـ ٣١ .

ژمارەی بنجی ل ١٩ - ٢٢ ؛ ٢ - ئاوەڵناوی تەرتیبی ل ٢٣ - ٢٦ ؛ ٣ - ئاوەڵناوی نەرتی ل ٢٧ - ٣١) • لێرەدا ئاشکرا ئەوە دەبینین ، لە ژمارە بە جۆرێك لە ئاوەڵناو دانراوە •

باسی ژمارەی بنجی ی ئەم کتێبە ، بە زۆری وەك ئەوەی کتێبی «ڕێزمانی کوردی»ی مامۆستا نووری عەلی ئەمین وایە[13] • بەتایبەتی لە ڕووی ڕۆنانەوە ، کە وتراوە :

«ژمارەی بنجی سادەیە یا لێکدەر :

أ - سادە لە (١)ەوە دەستپێدەکات هەتا (٩)•بە ژمارەی دە، بیست، چل ، پەنجا ، هەشتا ••• ) دەگوترێت (سەرەگری) •

ب - لێکدراویش ، یا لە دوو ژمارەی بنجیی تێکەڵ پێکدێت ، وەك (پانزدە•• شانزدە••• حەڤدە••) یا دوو ژمارەی بنجیی، کە بە بۆنەی ئامرازی لێکدەری (و) دەدرێتە دەم یەکتر ، وەك :

بیستوچوار ، چلوهەشت » (ل ٢٠)

لێرەشدا دیسان دەڵێین : بۆ دەبێ تەنیا لە (١) ەوە تا (٩) سادەبن • (دە) یاخود (سی ، چل ، سەد ••) بۆ دەبێ (سەرەگرێ) بن و جیاوازیان لەگەڵ (١) تا (٩) چییە؟•• خۆ (پەنجا، هەشتا•••) سادەنین و ـارێژراونو جیاوازییان لەگەڵ (دە ، سی ، چل •••)دا هەیە •

لە باسی ژمارەی لێکدراویشدا هەندێ ناتەواوی و هەڵە دەبینرێ :

ڕاستە (پانزدە•• شانزدە••• حەڤدە••) لێکدراون ، چونکە بوونەتە یەك وشە ، بەڵام ژمارەی وەك (بیستوچوار) یان (چلوهەشت) بە هیچ چەشنێك ڕاست نییە بە لێکدراو دابنرێن ، چونکە نەبوونەتە یەك وشە و وەك ئەوە وایە بوترێ (بەهار و زستان)؛ (ژن و پیاو)؛ (سلێمانی و هەولێر)

---

(١٣) بڕوانە ئەو باسەی لەم بەرهەمەدا (ل ٣٠ - ٣١) دەربارەی کتێبی « ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا نووری عەلی ئەمین کراوە •

.. سەرەڕای ئەوە باسی چۆنێتی پێکهاتنی ژمارەکانی (دووسەد ، سێسەد ..نۆسەد) نەکراوە ، بۆیە ئاشکرا نییە ، کە ئەمانە دەکەونە چ بەشێکەوە .

نووسەرانی ئەم کتێبە لە باسی ئاوەڵناوی پلەییدا دەڵێن :
«لەو ئاوەڵناوە بنچییانەی کە کۆتاییان بە پیتە دەنگی (وانە ونسۆنانت - ئەورحمان) دێت بە پاشگری (- ەم) و (- ەمین) دروست دەکرێت ، بەڵام ئەو ئاوەڵناوە بنچییانەی لە کۆتاییان بە پیتە بزوێن دێت پاشگری (- یەم) و (- یەمین) دروستدەکرێن » (ل ٢٤) . لەم چەند بڕەدا گەلێ هەڵە کراوە :
١ - ئەو جۆرە وشانە ئاوەڵناو نین و ژمارەن .
٢ - کۆتاییان بە پیت نایەت ، بەڵکو بە دەنگ کۆتاییان دێت .
٣ - ئەو زیادییەی دەخرێتە سەریان پاشگر نییە و نیشانەیە .
٤ - نیشانەکان (- یەم) ، (- یەمین) نین و (- ەم) ، (- ەمین)ن هەرچی ئەو (ی)یەشە یاریدەدەرە .
لە باسی ژمارەی کەرتی (ئەوان واتەنی - ئاوەڵناوی کەرتی)یشدا ، لەگەڵ ئەوەدا کە هەندێ جۆری باو و ڕەسەنی زمانی کوردییان ناونەبردووە ، کەچی شتی نەسازی وەک (سێ هەشتیەک ..)یان کردووەتە نموونە ، کە وا پێدەچێ لەم ساڵانەی دواییدا دروستکرابێ .

مامۆستا صالح حسەین حەسەن پشدەری لە کتێبی «کورتەیەک لە ڕێزمانی کوردی» (ل٣٨ - ٤٠)دا[14] ، ئەگەرچی پێناسەی ژمارەی نەکردووە و گەلێ تایبەتێتی گرنگی ژمارەی بنچی یادداشتنەکردووە و باسی ژمارەی پلەیی نەکردووە و وەک جۆرێکی ژمارە جیای نەکردووە

---

(١٤) صالح حسێن حەسەن پشدەری ، کورتەیێک لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٣٨ - ٤٠ .

ئەوە[15]و لە بەشی ڕۆنانی ژماردا باسی ژمارەی (١١) تا (١٩)ی نەکردووە..

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، بە ڕای ئێمە تا ڕادەیەك لێکۆڵینەوەیەکی سەرکەوتووە ، بەتایبەتی لە دوو ڕووەوە :

١ – ژمارەی بە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ داناوە .

٢ – لە بواری ڕۆناندا باسی ژمارەی باشتر لە نووسەرانی دی ڕێزمانی کوردی کردووە .

لە بەشێك لەو کارە زمانەوانییانەدا کە کوردناسانی سۆڤێت : د. قەناتی کوردۆ ، د. چەرکەزی بەکۆ ، د. کەریمی ئەیووبی و د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، د. مەکسیمی خەمۆ ، د. ڕ. ل. تسابۆلۆڤ ، د. زاریێ یووسف .. نووسیویانە ، چاومان بە باسی ژمارە دەکەوێ :

د. قەناتی کوردۆ لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» (١٩٥٧)دا[16] ژمارەی بەسەر شەش جۆردا دابەش کردووە :

١ – ژمارەی بنجی ؛ ٢ – ژمارەی پلەیی ؛ ٣ – ژمارەی کەرتی ؛ ٤ – ژمارەی لێکدەر ؛ ٥ – ژمارەی ئاوەڵکرداری ؛ ٦ – ژمارەی دابەش.

هەرچی لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو» (١٩٧٨)شدایە[17] باسی پێنج جۆری

---

(١٥) ئەوەی پێوەندیی بە کێشەی ژمارەی پلەیییەوە هەیێ ، ئەوەیە کاتێ لە نیشانەکانی ژمارەی بنجی دواوە ، وای داناوە کە ( ـ ەم ) بۆ پلەی بەراورد و ( ـەمین ) بۆ پلەی باڵا بەکاردێ ( ل ٣٩ ) . ئەگەرچی (ـین)ی (ـەمین) لە (ـین)ی «ـترین»ی پلەی باڵادەچێ ، بەڵام لە (ـەمین)دا مەسەلە پلەی باڵا نییە ...

(١٦) د. قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٣٩ – ١٥٦ .

(١٧) د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٨٦ – ٩٩ .

کردووە : ١ ـ ژمارەی بنجی (ل ٨٧ ـ ٨٩) ؛ ٢ ـ ژمارەی پلەیی (ل٨٩ ـ ٩٠) ؛ ٣ ـ ژمارەی دابەش (ل ٩٢) ؛ ٤ ـ ژمارەی لێکدەر (ل ٩٢ ـ ٩٣) ؛ ٥ ـ ژمارەی کەرتی (ل ٩٣ ـ ٩٥) ٠

جیاوازی بوونی شەش جۆر ژمارە لە کتێبی یەکەمدا و پێنج جۆر لە کتێبی دووەمدا ، ئەوەیە کە لە کتێبی یەکەمدا بەناوی (ژمارەی ئاوەڵکرداری)یەوە جۆرێك ژمارە جیاکراوەتەوە ، کە لە کتێبی دووەمدا ئەو سەرباسە نییە ٠ بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ، کە ئەو جۆرە ژمارەیە لە کتێبی دووەمدا خراوەتە سەر باسی (ژمارەی لێکدەر) ٠ بە هەر حاڵ جۆرەکانی ژمارە لای مامۆستا کوردۆ پێنج بن یان شەش ، ئەو ڕاستییە ناگۆڕێ ، کە جگە لەم سێ جۆرە : (١ ـ ژمارەی بنجی ؛ ٢ ـ ژمارەی پلەیی ؛ ٣ ـ ژمارەی کەرتی) ، ئەوانی دی ناکەونە بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە ٠٠٠ ڕاستییەکەی ئەوەیە ، بەشێکیان ئاوەڵکردارن و بڕێکیان ئەنجامی هەندێ عەمەلیاتی حیسابین ٠٠٠ جا ئێمە بە پێویستی نازانین باسی ئەو شتە لاوەکییانە بکەین ، بۆیە وەلاوەیان دەنێین و دێینە سەر هەڵسەنگاندنی باسی سێ جۆرە ڕاستەقینەکە٠ لەبەر ئەوەش کە کاری هەرە گەورە و دیار و زانستی دە قەقانی کوردۆ کتێبی «دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو)»ە و تێیدا بە وردی و دوورو درێژی لە ژمارە (ل ٨٦ ـ ٩٩)ی کۆڵیوەتەوە ، دەیکەینە کەرەستە و سەرچاوەی سەرەکیی ئەم باسەمان ٠

شایانی باسە ، کە دە٠ کوردۆ گەلێ ڕووی بەشە ئاخاوتنی ژمارەی لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردی ـ کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو ـ دا ڕوونکردووەتەوە و زانیاریی باش و نوێی تۆمارکردووە و

بە شێوەیێکی زانستییانە کۆلیوەتەوە ، بەڵام ناوەناوە تێکەڵکردن لە ...ەیدا دەبینرێ و هەروەها گەلێ لایەنی گرنگیش هەن باس‌نەکراون :

بۆ نموونە . نووسەر لە ڕووی ڕۆنانەوە لە(ژمارەی بنجی) نەدواوە و هیچ تایبەتییەکی ئەوتۆی ئەم جۆرە ژمارەیەی باس نەکردووە ... ناتەواوی دیاریش بەتایبەتی لەوەدایە ، کە فۆرمی هەندێ ژمارەی بە هەڵە ژمارکردووە :

لەکرمانجیی خواروودا بەرانبەر ژمارەی (١٢) نووسیوێتی : «دۆنزدە» (ل ٨٧) . کە ڕاستی‌یەکەی (دوازدە)یە . بەرانبەر (١٧) نووسیوێتی « حەوتدە» (ل ٨٧) ، کە ڕاستی‌یەکەی (حەڤدە)یە . بەرانبەر (٥٠) نووسیوێتی «پێنجی» (ل ٨٨) ، کە ڕاستی‌یەکەی (پەنجا)یە ، بەرانبەر (٩٠) نووسیوێتی «نەوێد» (ل ٨٨) ، کە ڕاستی‌یەکەی (نەوەد)ە ...

هەرچەندە دە کوردۆ لە باسی ژمارەی پلەیی (ل ٩٨ ـ ٩٠)دا نیشانە ...ەرەکی‌یەکانی (ـ ەم) ، (ـ ەمین) ، (ـ وم) و هەندێ نیشانەی دی باس‌کردووە، کە دەچنە سەر ژمارەی بنجی و دەیانکەنە پلەیی ، بەڵام ناوی ...انەکانی (ـ ۆم) ، (ومی) .. نەبردووە ... لە باسی ژمارەی کەرتی ...(ل ٩٣ ـ ٩٥)یشدا ناوی پێکهاتنی (سێ‌یەك ، چواریەك...)ی نەبردووە ، ... شێوەی هەرە دیار و باوە .

لە بەرهەمە زانستی‌یەکانی بەر لە ساڵانی حەفتای دەچەرکەزی بەکۆدا ...ڕنگی بە باسی ژمارە دراوە[18] . ساڵی ١٩٧٣یش لە کتێبی «زمانی

(١٨) بەوێنە :
اـ چ. خ. باکاییێف ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ١٠٩ ـ ١١١ .
بـ چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ، ١٩٧٣ ل ١١٧ ـ ١٢١ .

کوردەکانی سۆڤیێت»دا[١٩] باشتر لێی دواوە • مامۆستا بەکۆ لەم لێکۆڵینەوەیدا لەسەر بناغەی کەرەستەیەکی زۆری بەتە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤیێت و بەراوردکردن لە نێوانیاندا زاناینە و شارەزایانە لە ژمارەی نوێیوەتەوە و چوار دەستەی دیاری کردووە : «١ - ژمارەی پنجی» (ل ١٢٦ - ١٣٤) ؛ «٢ - ژمارەی پلەیی» (ل ١٣٤ - ١٣٦)؛ ٣ - ژمارەی کەرتی» (ل ١٣٦) ؛ « ٤ - ژمارەی دابەش» (ل ١٣٧) •

جیاکردنەوەی جۆرەکانی ژمارە لای د• بەکۆ هەر وەك مامۆستایان : سەعید صدقی و نووری عەلی ئەمین ••• وایە ، ئەوەتە ئەمیش چوار جۆر ژمارەی دیاری کردووە و چەشنی چوارەم - «ژمارەی دابەش» ، کە ژمارە نییە ، بە جۆرێك لە ژمارە داناوە ••• لە ڕووی ڕۆنانی ژمارە نانیشینەوە وەك د• کوردۆیە - واتە ئەو باسە گرنگەی خستووەتە پشت گوێ •

هەڵەیەکی دیاری ئەم بەرهەمە لە باسی شێوەی ئەو نیشانانەدایە کە یاریدەی پێکهێنانی ژمارەی پلەیی دەدەن • مامۆستا چەرکەزی بەکۆ (- وۆم) و (- وۆمی) و (- یۆم)یشی لەگەڵ (- ۆم) و (- ۆمی) داناوە (ل ١٣٤ - ١٣٥) ، بەڵام ئاشکرا دیارە کە (و)ی سەرەتای (- وۆم) و (- وۆمی) نیمچەبزوێنە و پێویست هێناویەتییە ناوانەوە و لەگەڵ ئەسڵی نیشانەکاندا نییە - واتە نیشانەکان (- ۆم) و (- ۆمی)ن ، نەك (- وۆم) و (- وۆمی) ••• هەرچی (- یۆم)یشە دیسان هەر (- ۆم)ە و (ی)یەکەی سەرەتای نیمچەبزوێنە و لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا بووە •

د• کەریمی ئەیووبی و د• ئی• ئا• سمیرنۆڤاش لە کتێبی «دیالێکتی کوردی موکری»دا[٢٠] چوار جۆر ژمارە : (١ - ژمارەی بنجی ؛

---

(١٩) چ• خ• باکاییف ، زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٢٦ - ١٣٧ •

(٢٠) ك• ڕ• ئەیووبی و ئی• ئا• سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٥٣ - ٥٥ •

٢ - ژمارەی پلەیی ؛ ٣ - ژمارەی کەرتی ؛ ٤ - ژمارەی دابەش)یان دیاری کردوە •

لەبارەی باسی (ژمارەی بنجی) ئەم بەرهەمەوە سەرنج بۆ چەند خاڵێك ڕادەکێشم :

١ - گەلێ تایبەتێتی ئاشکرای ئەو بەشە دیالێکتە یادداشت نەکراوە •

٢ - لە ڕووی ڕۆڤانی ژمارەکانەوە هیچ لێدوانێك بەرچاو ناکەوێ •

٣ - ئەوە وتراوە ، کە ژمارەی (یەك) وەك پاشگری (ـ یَك) بەدەردەکەوێ، کەچی پەنجە بۆ ئەوە ڕانەکێشراوە، کە (ـ ێ)ی کورتکراوەی (ـ یَك)یش هەیە •

نووسەرانی ناوبراو لە باسی ژمارەی پلەیی (ل ٥٤ ـ ٥٥)دا وا ڕادەگەیەنن ، کە «لە ژمارەی (نۆ) ژمارەی پلەیی بە یاریدەی پاشگر (ڕاستتر نیشانە ـ ئەوڕەحمان)ی (ـ یَم) سازدەبێ»(ل ٥٤) • بەر لە هەر شت ئەوە ڕووندەکەینەوە ، کە وشەی (نۆ) کۆتایی بە بزوێن هاتووە و نیشانەی (ـ یَم) بە بزوێن دەستپێئەکات • جا دەزانین کە دوو بزوێن پێکەوە نایەن • ئەیووبی‌و سمیرنۆڤا خۆشیان لە زۆر شوێنی کتێبەکەیاندا ئەو ڕاستی‌یەیان وتووە ••• وێڕای ئەوە ئاشکرا دیارە وشەی (نۆ) ، کە بزوێنی (ۆ) کۆتایی‌یەتی ، وەك ئەو وشانەی بە (ا، ێ، ی، ە) کۆتاییان دێ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ و دەوترێ (نۆیەم) •

هەر لەم بەشەدا ئەوەشیان وتووە ، کە : «ئەو ژمارانەی کۆتاییان بە ،نگی بزوێن دێت (جگە لە نۆ) ، کاتێ نیشانەی (ـ مم ، ـ ممین)یان خرێتەسەر ، لە نێوان کۆتایی ژمارەکان و سەرەتای وشەکاندا نەبزوێنی (ه) یان (ی ـ y ) بەیدا دەبێ» (ل ٥٤) • لەم بارەیەوە دەڵێین :

١ ـ نەبزوێنی (ە) لە زوودا نەبووە و تازە هاتۆتە ناوانەوە و لـە لاوە هێنراوە • ئەمڕۆش کە بەکاردێنرێ ، تەنیا بـۆ ئەو ژمارانـە نییـە ، کـە کۆتاییان بە دەنگی بزوێن دێ ، بەڵکو بۆ تێکڕای ژمارەکان ـ واتە بۆ ئەو ژمارانەشە ، کە بە نەبزوێن کۆتاییان دێت • بەوێنە چۆن دەوترێ (سێهەم) بە هەمان شێوە دەشوترێ (چوارهەم) •

٢ ـ هەرچی نیمچەبزوێنی (ی ـ y )یشە ڕاست نییە بوترێ دەچێتـە سەر هەموو ئەو ژمارانەی کۆتاییان بە بزوێن دێ ، چونکە ئەوەتە ژمارەی (دوو) کۆتایی بە بـزوێن دێ و نـاشێ (ی ـ y )ی بخرێتـە سـەر ـ واتـە نـاوترێ (دوویەم) •

د• مەکسیمی خەمۆ لەو کارە زانستییـەیدا ، کـە بەنـاوی «زمـانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق »ەوە بـڵاوی کردۆتـەوە[٢١] ، زۆر بە کورتی لە بەشە ئاخاوتنی ژمارە دواوە (ل ٣٣٤ ـ ٣٣٥) • ئـەمیش وەك گـەلێ ڕێزمانـنووسی دی کوردی ، ژمـارەی بەسـەر چـوار جـۆردا : (١ ـ بنجی ؛ ٢ ـ پلەیی ؛ ٣ ـ کەرتی ؛ ٤ ـ دابەش) دابـەش کـردووە • لەم بەرهەمەدا باسی ژمارە نەك هەر بە کـورتی کـراوە و بـە لاپـەڕەیـەك کوتایی پێهێنراوە ، بەڵکو ئەو زانیارییـانەش کـە تۆمـارکراون تـەواو سادەن • بەوێنە لە باسی (ژمارەی بنجی)دا لەوە زیاتر کـە نـاوی ژمارەی یـەکـان ـ (١ تـا ١٠) و دەیـان ـ (٢٠ ، ٣٠ ••• ٨٠)و سـەدان (٢٠٠ ، ٣٠٠ ـ ٩٠٠) و وشەی (هەزار) و (دووهەزار) تۆمارکراوە ، هیچی دی باس نەکراوە ••• یاخود لە باسی (ژمارەی پلـەیی)دا هـەر ئـەوەنـدە

(٢١) د• مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێـراق ، کتێبی « وڵاتان و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك و ناوەڕاسـت » ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٣٤ ـ ٣٣٥ .

وتراوه ، كه نه بەشه دیالێکتی بادیناندا (ـ ێ) دەچێته سەر ژمارەی بنجیو دەیکاته ژمارەی پلەیی ...

د. ر. ل. تسابۆلۆف له کتێبی «لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە»[٣٢] باسی (ژمارەی بنجی)و (ژمارەی پلەیی) کردووه (ل ٣٣ - ٣٦).

ڕووی باش و سەرکەوتووی ئەم کاره بەتایبەتی لەوەدایه که لەسەر شێوازێکی زانستیو بەراوردیی مێژوویی نووسراوه و بەشێکی زۆری ئەو ژمارانەی باسیانکراوه ، لەگەڵ ئاوێستا و فارسیی کۆن و فارسیی ناوەڕاست و ... دا بەراورد کراون . ناتەواویی دیاریشی ئەمانەیه :

١ - نووسەر لەوەدا ڕاست نییه ، که شێوەی پێشکەوتنی هەندێ ژمارەی زمانی کوردیی و زمانه ئێرانییه نوێکانی دی خستۆته ژێر تەئسیری پێشکەوتنی زمانی فارسییەوه .

٢ - پێویست بوو باسی ئەو ژمارانەش بکات ، که له دوا (١٠)ەوه دێن و نەدەبوو لێکۆلینەوەی له ژمارەی بنجیی زمانی کوردی تەنیا بریتی بێ له لێدوان له ده ژمارەی سەرەتا .

٣ - له باسی ژمارەی پلەییدا (ـ ەمە)ی به نیشانەی سەرەکی داناوه ، بەڵام ڕاستییەکەی ، ئەوەیه که ئەو (ـ ەمە) له زمانی کوردیدا بووه به (ـ ەم) ...

٤ - دەربارەی تایبەتییەکانی ژمارەی بنجی و ژمارەی پلەیی هیچی نەوتووه و سەرەڕای ئەوەش ناوی ژمارەی کەرتی نەبردووه .

---

(٣٢) ر. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوه ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣٣ - ٣٦ .

د. زاری یووسف له کتێبی «دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی» (ل ٦٥ – ٦٨)دا[٢٣] دەربارەی ژمارە زانیاریی باشی تۆمارکردووە. بەوێنە:

١ ـ ئەوەی یادداشت کردووە ، کە لە زمانی کوردیدا ژمارەی بنجی کاتێ چەندێتیی ناوێك ڕادەگەیەنێ ، لە پێش ناوەکەوە دێت (ل ٦٥) .

٢ ـ لەوە دواوە کە ژمارەی (یەك) زۆر جار لەگەڵ ناودا لە شێوەی نیشانەی (ـ یك)دا دێت (ل ٦٦) .

٣ ـ لە باسی پێکهاتنی ژمارەی کەرتی بە یاریدەی نیشانەی ئیزافەی (ـ ی)دا ئەوەی دیاری کردووە ، کە (ـ ی)یەکە بە ژمارەی یەکەمەوە دەلکێ (ل ٦٧) .

٤ ـ لە ڕووی ڕۆنانەوە لە ژمارەی کۆلیوەتەوە (ل ٦٥) .

...و هەندێکی دی .

ئەگەرچی نووسەر تێکڕا لە لێکۆڵینەوەی ژمارەدا سەرکەوتووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ناتەواوی و هەڵە لە باسەکەیدا دەبینرێ .

بۆ نموونە :

١ ـ نووسەر لەوەدا ڕاستە ، ، ئەگەر لە پێش ژمارەوە ئاوەڵکرداری «نزیك»بێت ، ئەوە ژمارەکە واتای تەقریبی وەردەگرێ (ل ٦٦) ، بەڵام وەك ئاشکرایە قالبی (نزیکی) ، (نزیکەی)یش هەیە و د. زاری یادداشتی نەکردوون . کەچی لەسەرێکی دییەوە «نزیکە» و «هەتا»ی لەتەك «نزیك»دا داناوە... وەك هەموو دەزانین، شێوەی «نزیکە» بەکارنایەت و وشەی «هەتا»ش ئەو دەورە نابینێ ... بەڵام ئەوەتە وشەی «دەوروبەری» هەیە ، کە ئەو ئەرکە بەجێدێنێ و نووسەر بەلایدا نەچووە.

٢ ـ بەڵێ باش بۆ ئەوە چووە ، کاتێ ژمارەی (یەك) دەوری ناو

---

(٢٣) زاری یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥ ، ل ٦٥ ـ ٦٨ .

دەبینێ نیشانەی (ـ ێك)ی نەناسیاوی پێوە دەلکێ ، بەڵام دەبوو نیشانەی (ـ ێ)یش لەبیرنەکات .

٣ ـ دە زارێ هەموو ژمارە دەیی یەکانی (دە ، بیست .. حەفتا .. نەوەد)ی بە سادە داناوە (ل ٦٥) . وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە ، ژمارە دەیی یەکان جگە لە سادە ، دارێژراو و لێکدراویشیان تێدایە .

٤ ـ نووسەر لە باسی ژمارەی پلەیی دا بە هیچ چەشنێك لەو دوخە نەدواوە ، کە ژمارەی بنجی کۆتایی بەبزوێنی (ا ، ێ ، ی ، ۆ ، ە) دێت و نیمچە بزوێنی (ی ـ) پەیدادەبێ ، یاخود کە بە بزوێنی (وو)ش تەواو دەبێت نیمچەبزوێنی (و ـ w) دەبێتە یاریدەدەر .

... و هەندێکی تر .

ئەگەر بۆ باسی ژمارە ئاوڕێك لەو کارانەش بدەینەوە ، کە بە زمانە ڕۆژئاواییەکان لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراون ، بەداخەوە شتێکی ئەوتۆمان دەستگیر نابێ بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەمان کەڵکی لێ وەربگرین و بیخەینە سەر خەرمانی لێدوانەکەمان ... چونکە لە بەشێکیاندا ئەو باسە نابینرێ و لە بەشەکانی دیشدا (جگە لە کتێبی Manuel De Kurde - Dialecte Sorani)ی دە جۆیس بلۆ[٢٤] لێدوانێکی کورتی سەرپێیی کراوە . بۆ نموونە :

دە ئەرنست مەکارۆس لە کتێبی «ڕێزمانی کوردی»دا[٢٥] بە هیچ چەشنێك دەربارەی ژمارە نەدواوە ... دە مەکەنزی لە لاپەڕە (٧١ ـ ٧٢) و (١٦٩ ـ ١٧٠)ی ئەو کتێبەی سالی ١٩٦١ لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە بلاوی کردووەتەوە[٢٦] ، بە کورتی لە (ژمارەی بنجی) و

24- Joyce Blau ,Manuel De Kurde, Paris, 1980, PP. 79-85.

25- Ernest N. Maccarus, A Kurdish Grammar, New-York, 1958. PP. 71-72, 169-170.

26- D.N. Mackenzie, Kurdish Dialects Studies, London, 1961,

ژمارەی پلەیی) دواوە و هەموو باسەلەتی تەنیا بریتی‌یە لە ناوی هەنـدی
ژمارەی بنجی لە بەشە دیالێکتەکانی سلێمانی و بنگرد و پژدەر و موکری..
سورچی و ئاکری و ئامێدی و زاخۆ ... دا و پێکهاتنی ژمارەی پلەیی بە
ڕێدەی نیشانەی (ـ ەم ، ـ ەمین) و (ـ ێ) .

دە جۆیس بلۆ لە لاپەڕە (٧٩ ـ ٨٥)ی کتێبی ناوبراودا تا ڕادەیەك باش
ە (ژمارەی بنجی)و (ژمارەی پلەیی)و (ژمارەی کەرتی) دواوە و نموونە و
بەڵگەی لەباری هێناوەتەوە و هەندێ تایبەتێتی‌یانی باس کردووە ...



بـەم شێوەیە ـ واتـە دوای کـەمێ نیشاندانی ئەمومی چی لەبارەی
ژمارەوە لە زمانی کوردیدا نووسراوە ـ دەتوانین ئەم ئەنجام و تێبینی‌یانـە
بخـەینـە پێش‌چـاو :

١ ـ بەشێك لە نووسەران ( ژمارە ) یان لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا
باس‌کردووە و بـە جۆرێـك لـە جۆرەکانی ناویـان لەقـەڵەمداوە ، وەك :
سـەعید صـدقی کابـان ، جگـەرخـوێن ...

هەندێکیش بە جۆرێك لە ئاوەڵناویان داناوە ، وەك : تۆفیق وەهبی .
نـووری عـەلـی ئـەمیـن ...

بڕێکیش مامەڵەی بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیان لەگـەڵ کردووە .
وەك : محـەمـەد ئـەمین هـەورامـانی ، صـالح حـەسـەین حـەسـەن ، دە
قـەنـاتی کـوردۆ ......

چۆن بە هیچ جۆرێك ناتوانین ڕای ئەو نووسەرانە وەربگرین ، کـە
لەبەر ڕووناکیی ڕێزمانی‌عەرەبی ژمارەیان بەناو لەقەڵەمداوە،هەر بەو چەشنە
ڕای ئەوانەش کە لەسەر شێوازی چاولێکەریی زمانی ئینگلیزی ژمـارەیان

به ئاوەڵناو داناوە ، بە لامانەوە پەسەند نی‌یە . چونکە ئاشکرایە ، ژمارە وەك بەشە ئاخاوتنێك خاوەنی خاسیەتی واتای ژمارەیە بەگشتی ، کە وەك دیاردەیێکی تایبەتی ـ واتە وەك ژمارە بە تەنیا یان ژمارەی شتێك ... واتای گشتی‌ی ئەم بەشە ئاخاوتنە لە خاسیەتی ڕێزمانی‌دا ڕەنگ دەداتەوە. وێرای ئەوە ، ژمارە لە ڕووی پێکهاتنەوە خاوەنی تایبەتی‌یێکی دیاری کراوی وەهایە ، کە لە بەشە ئاخاوتنەکانی دی جیادەکاتەوە ... بۆ گەیاندنی واتای ژمارە لە سیستەمی بەشە ئاخاوتنی ژمارەدا ڕێگەی ئەوتۆ بەکاردێنرێ ، کە لە سیستەمی بەشە ئاخاوتنی ناودا بەکارناهێنرێ . ئەم تایبەتێتی‌یانەش خاسیەتی ژمارە دیاری‌دەکەن و وەك بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ جیای‌دەکەنەوە و نیشانی ئەوە دەدەن ، کە ڕاست نی‌یە بخرێتە بەشە ئاخاوتنی ناوەوە ... ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا بتوانین ئەو چەند وێکچوونە ڕێزمانی‌یە کەمەی نێوان ژمارەی پلەیی و ئاوەڵناو بە بەڵگەی دانانی ژمارەی پلەیی بە ئاوەڵناو وەربگرین ، ئەوە بە هیچ چەشنێك ناتوانین ئەو ڕایەی هەندێ نووسەران پەسەند بکەین ، کە ژمارەی بنجی‌یش بە ئاوەڵناو لە قەڵەم دەدەن . ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا لە نێوان ژمارەی پلەیی و ئاوەڵناودا کەمێ وێکچوونی ڕێزمانی هەبێ ، ئەوە لە زمانی کوردیدا ئەو وێکچوونە زۆر کەمترە ...

٢ ـ نووسەرانی ڕێزمانی کوردی کاتێ لە ڕووی تایبەتێتی واتا و چۆنێتی بەکارهێنانەوە ژمارە دابەش‌دەکەن بەسەر جۆری جیاوازدا ، جیاوازی‌یەکی زۆر لە نێوان دابەش‌کردنەکانیاندا بەدی‌دەکرێ . بەوێنە مامۆستا تۆفیق وەهبی جارێك دووجۆر ژمارە : (١ ـ بنجی؛ ٢ ـ پلەیی)و جارێکی دی سێ جۆر : (١ ـ بنجی ، ٢ ـ پلەیی ، ٣ ـ کەرتی)ی دیاری‌کردووە . مامۆستایان : سەعید صدقی کابان ، نووری عەلی ئەمین ،

جنگەرخوێن ، ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، دە چەرکەزی بەکۆ ... چوار جۆر : (١ – بنجی ، ٢ – پلەیی ، ٣ – دابەش ، ٤ – کەرتی)یان یادداشت کردووە . دە قەناتی کوردۆ شەش جۆر : (١ – بنجی، ٢ – پلەیی، ٣ – کەرتی ، ٤ – لێکدەر ، ٥ – ئاوەڵکرداری ، ٦ – دابەش)ی دەستنیشان کردووە ...

ئەم جیاوازی‌یەش ئەوە نیشاندەدا ، کە هەندێ نووسەر ژمارەی کەرتی بە جۆرێك لە ژمارە دانانێن ، بڕێك ژمارەی پلەیی ناخەنە نێو بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە ... بەپێچەوانەشەوە ، نووسەری وا هەیە ئەنانەت ئاوەڵکرداری (یەك‌یەك ، دوودوو ، سێ‌سێ ...)و وشەی چەندێتی لادیاری وەك (زۆر ، کەم ...)یش بە چەشنەکانی ژمارە لەقەلەم دەدەن .

لە ڕێگای هەڵسەنگاندنی ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی (ژمارە)دا کراون و بەپێی بۆچوون و لێکدانەوە و تۆژینەوەی تایبەتی خۆمان و بە هۆی کەڵك وەرگرتن لە تیۆریی زمانناسی‌یەوە گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامەی لە زمانی کوردیدا سێ جۆر ژمارە : (١ – بنجی ، ٢ – پلەیی ، ٣ – کەرتی) دیاری بکەین .

٣ – بڕێ نووسەر ناوی ژمارەکانی نێوان (١١ – ١٩)یان بە شێوەی ئاخاوتنی سلێمانی و هەندێ شێوە ئاخاوتنی دی تۆمارکردووە : (یانزە – یانگزە ... پانزە – پانگزە ... حەڤدە ...) .

ئەسڵی ئەو وشانە کە (یازدە... پازدە... حەڤدە...)ن ، بێ‌گومان چ بۆ نووسین و چ بۆ زمانی ئەدەبی ، ڕاست وایە پەیڕەوی ئەسڵەکەیان بکرێ ...سوان و تێچوونی (د) ڕوونکردنەوە و لێکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ .

چونکە لە زۆر شوێنی وشەدا دەفرتێ ، بۆیە ئەمڕۆ لە زۆر شوێنی کوردستاندا ، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانیدا دەنگی (د)ی ژمارەکانی (یازدە... پازدە... حەڤدە) سواوە و دەوترێ (یانزە ـ یانگزە ـ پانگزە ـ پانگزە...حەڤقە)، لەبەرئەوەی قووتدانی ئەم (د)ە بووە بەهۆی قورسیی دەربڕینی ئەو وشانە ، بۆیە ئاخێوەر بۆ سووککردنی ئەو تالەباری یە ناچار بووە دەنگی (ن) یان (نگ) بێنێتە ناو (یازە ... پازە ...)ەوە و (ق)ی (حەڤە)ش دووبارە بکاتەوە .

٤ ـ بەشی هەرە زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە ڕووی ڕۆنانەوە لە ژمارە نەدواون و ئەو بەشە کەمەش کە باسیان کردووە ، ژمارەی دەیانی (بیست ، سی ، چل ، پەنجا ، شەست ، حەفتا ، هەشتا ، نەوەد)یان بە سادە داناوە ... بەڵام بەڵگەی مێژوویی وا ڕادەگەیەنێ «حەفتا ، هەشتا» و «پەنجا ، شەست ؟» بە یارمەتی (ـات)ی ئێرانی سازبوونو لە کوردیدا (ت) تێداچووە و (ا) ماوەتەوە ... وشەی «نەوەد / نەوەت» یش یان بە هاریکاری پاشگری (ـتی) ئاوێستا یان (ـ ات)ی ئێرانی پێکهاتووە و هەندێ گۆڕانی بە سەردا هاتووە ... هەرچی (بیست ، سی ، چل)ە ڕواڵەتیان سادەیە .

٥ ـ زوربەی توێژەران وایان نیشانداوە ، کە جگە لە(ـەم،ـەمین) و (ـیەم ، ـ یەمین) و (ـ هەم ، ـ هەمین) یش نیشانەی سازکردنی ژمارەی پلەیین ...

وەك ئاشکرایە ، ئەو (ی)یە ، یان ئەو (ه)ە لەگەڵ ئەسڵی نیشانەکاندا نین. (ی ـ y )ی نیمچەبزوێن و (ه)ی نەبزوێن بۆ لەهێشتنی گرفت و

ـسانکردنی دەربڕینی دێنە ناوانەوە ، وێڕای ئەوە ، پەنجە بۆ دوو ڕاستییش ڕادەکێشین :

أ) ئەگەر ژمارە بنچییەکە کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت . ئەوە وەك زوێنەکانی دی نیمچەبزوێنی (ی – y ) یارمەتی نادا ، بەڵکو نیمچەبزوێنی (و – w ) ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ .

ب) نەبزوێنی (م) لە زوودا نەبووە و تازە هاتۆتە ناوانەوە و لە لاوە هێنراوە . ئەمڕۆش کە بەکاردێنرێ ، تەنیا بۆئەو ژمارانە نییە کەکۆتاییان بە دەنگی بزوێن دێ ، بەڵکو بۆ تێکڕای ژمارەکانە – واتە بۆ ئەو ژمارانەشە ، کە بە نەبزوێن کۆتاییان دێت . بەوێنە چۆن دەوترێ (سێهەم) ، بە هەمان شێوە دەشوترێ (چوارەم) ...

٦ – دەربارەی تایبەتێتییەکانی ژمارەی بنچی و ژمارەی پلەیی و ژمارەی کەرتی ، هەندێ نووسەر هیچیان نەوتووە . ئەو نووسەرانەش کە باسیان کردووە ، بە لای گەلێ ڕووی گرنگ و ئاشکرادا نەچوون ، لەگەڵ ئەوەدا کە تایبەتێتی هەر یەکێك لەو سێ جۆر ژمارەیە : (١ – بنچی . ٢ – پلەیی ، ٣ – کەرتی)ی کوردی لە زۆر ڕووەوە سەرنجی تۆژەر ڕادەکێشێ و بواری باس کردنی یەکجار فراوانە .

٧ – هیچ یەکێك لە نووسەران (جگە لە د. ڕ. ل. تسابۆلۆف) لە ڕووی بەراوردیی مێژووییەوە لە ژمارەکانی زمانی کوردی نەدواون – واتە لەگەڵ زمانی ئاوێستا و زمانی هیندیی کۆن و زمانی فارسیی کۆن و ناوەڕاست و نوێو زمانی پشتۆ و زمانی بلووچی ... دا بەراوردیان نەکردوون – کە بەڕاستی ئەم ڕێگەیە گەلێ شتی نائاشکرامان بۆ ڕوون دەکاتەوە ... هەرچی بەراوردەکەی د. ڕ. ل. تسابۆلۆفیشە . بەداخەوە . تەنیا لە مەیدانی دە ژمارەی سەرەتادایە .

- ٢ -

## لێکۆڵینەوەکانی خۆم لەبارەی « ژمارە »وە

بەشە ئاخاوتنی ژمارە ئەو کۆمەڵە وشەیەیە کە وا ئەرکی تەجریدی ناوی ژمارە (دوو + سێ = پێنج) دەگەیەنێ ، یان چەندێتی بەسەریەکەوە (هەشت کراس) . یاخود کەرتێکی شتی دیاریکراوی هاوڕەگەز (سێ‌یەکی گەنمەکە) نیشان دەدات . پلەی شتێك لە ڕیزدا (نھۆمی سێیەم) دیاری دەکا .

ژمارە وەك بەشە ئاخاوتنێك خاوەنی خاسیەتی واتای ژمارەیە بەگشتی ، کە وەك دیاردەیێکی تایبەتی - واتە وەك ژمارە بەتەنیا یان ژمارەی شتێك... واتای گشتی ئەم بەشە ئاخاوتنە لە خاسیەتی ڕێزمانی‌یدا ڕەنگ‌دەداتەوە . وێڕای ئەوە ژمارە لە ڕووی پێکهاتنەوە خاوەنی تایبەتێتی‌یێکی دیاریکراوی وەهایە ، کە لە بەشە ئاخاوتنەکانی دی جیادەکاتەوە .

لە باسی ژمارەدا پێویست دەکا جارێکی دیش بەتایبەتی ئەوە دووپات بکرێتەوە ، کە ئەوەی لە دیاریکردنی گرووپی وشەدا گرنگە و لەسەر بنەمای دابەش‌دەکرێن بەسەر بەشە ئاخاوتنی جیاوازدا ، ئەوەیە کە پێویستە پێوەندی هاوخاسیەتی ڕێزمانی لە نێوان وشەکانی هەر گرووپێکدا هەبێ . وا پێویست دەکا گرنگی‌یێکی تەواو بەم لایەنە بدرێ . لێرەدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشین ، کە هەندێ جار ئەم لایەنە لەبەرچاو ناگرن و تەنیا لە ڕووی خاسیەتی واتاوە بەشە ئاخاوتنی ژمارە جیادەکەنەوە و وەك وشەیێك کە واتای ژمارە بدات یان پلەی ژمارە ڕابگەیەنێ ، دیاری‌دەکەن . بەوپێ‌یە هەندێ وشە کە واتای ژمارەیان تێدایە ، دەکەونە ئەم بەشە ئاخاوتنەوە . بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جۆرە وشانە تەنیا واتای ژمارەیان تێدایە ، دەنا ژمارە

ن • بەوێنە ئەگەر تەماشای وشەکانی «حەفتە» • «سەدە» ••• و «حەفت» ، «سەد» •••بکەین ، دەبینین هەرچەندە لە هەردوو دەستەدا وەك یەك مانای ژمارە هەیە ، بەڵام لە ڕووی خاسیەتی ڕێزمانی‌یەوە جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە و سەر بە بەشە ئاخاوتنی جیاوازن • .

لە ڕاستیدا لە باری خاسیەتی ڕێزمانی‌یەوە وشەی «حەفتە»و هەروەها «سەدە»ش جیاوازیان لەگەڵ هیچ ناوێکی ئاسایی‌دا نی‌یە • چۆن دەوترێ «چوار پیاو» هەر بەو چەشنەش دەشێ بوترێ «چوار حەفتە» ، «چوار سەدە» ••• چۆن دەوترێ «پیاوێك ، پیاوەکان •••» بەهەمان جۆر دەشوترێ «حەفتەیەك ، حەفتەکان •• سەدەیێك ، سەدەکان •• »••هتد •

ئەگەرچی لەباری چەندێتی‌یەوە «حەفتە» لەگەڵ «حەفت» و «سەدە» لەگەڵ «سەد» وەك یەکن ، بەڵام «حەفت»و «سەد» ژمارەن و «حەفتە»و «سەدە»ش ناون و لە ژمارەوە بوونەتە ناو •

بۆ پتر ڕوونکردنەوە ، ئەوەش دەڵێین ، کە ژمارە لەباری واتاوە ڕێتی‌یە لە تەجریدی ناوی ژمارە بێ ئاڵۆزبوونی واتا • بەوێنە وشەی «چل» و «چلە» چەندێتی ڕادەگەیەنن ، بەڵام تەنیا وشەی «چل» دەکەوێتە نێو بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە • هەرچی «چلە»یە سەر بە بەشە ئاخاوتنی ناوە • وشەی «چل» ژمارەیە ، چونکە واتای تەجریدی ژمارەی تێدایە • ئەم وشەیە یەك مانای هەیە و ماناکەی لە چوارچێوەی نیشاندانی ژمارەیێك لە ژماردنی دانەی دیاری‌کراودایە • وشەی «چلە» ، ئەگەرچی دیسان واتای چەندێتی هەڵگرتووە ، بەڵام مانای لە سنووریێکی بەرین و فراواندا پێوەندی بە زۆر شتەوە هەیە : ۱) بە ژماردنی «چل»ەوە ، ۲) تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بەسەر لەدایك‌بوونی منداڵێکدا یان مردنی یەکێکدا یان هێنانی بووکێکدا ، ۳) چل ڕۆژ لە ناوەڕاستی هاوین و زستاندا ••• هتد • ڕاگەیاندنی واتای چەندێتی لە وشەی «چلە»دا بێ‌بەشە

ەو خاسیەتی تەجریدەی لە ژمارەدا هەیە .

ژمارە کاتێ لەگەڵ ئەو جۆرە ناوانەدا دێ ، کە لە ژمارەوە وەرگیراوە دەبێتە دیارخەری . وەك : چوار حەفتە ـ حەفتەی چوارەم ، حەوت سەدە سەدەی حەوتەم ...

لە زۆر زماندا کاتێ تەماشای ئەو وشانە دەکرێ کە سەر بە ژمارەن . پتر وا باوە بەسەر بنجی (چوار ، شەش ، بیست ...)و ژمارەی پلەیی (چوارەم ، شەشەم ، بیستەم ..) دا دابەشیدەکەن ، کە خاوەنی هەندێ خاسیەتی جیاوازن .

٤ لە زمانی ئینگلیزیدا ئەوەی پێوەندی بە ژمارەی پلەییەوە هەیە . ئەوەیە بە ئاسانی هەست دەکرێ خاوەنی هەمان خاسیەتی ڕێزمانییانەیە . کە ئاوەڵناو هەیەتیو هیچ تایبەتییێکی ئەوتۆ نییە لە ئاوەڵناوی جیابکاتەوە و ببێتە هۆی ئەوەی بە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ دابنرێ . وێڕای ئەوە ، بنەمای وا نییە ببێتە بەڵگەی دانانی لە بەشە ئاخاوتنی ژمارەدا[1] ...«ژمارەی پلەیی جیاوازی لەگەڵ ئاوەڵناوی ئاساییدا تەنیالە ڕووی واتاوەیە ، ئەویش ئەوەیە کە ژمارەی پلەیی تەرتیبی شت لە ڕیزدا دیاریدەکا . ژمارەی پلەیی تایبەتییێکی ڕێزمانیشی نییە ، کە ئەو مانایەی پێدەربڕێ . وەك هەموو ئاوەڵناوێکیش حاڵەتی کۆ ودۆخیان نییە ... ڕاستە لەو تایبەتییە ئاشکرایەی ئاوەڵناو ، واتە ـ پلەی بەراورد و پلەی باڵا ـ بێبەرە ، بەڵام ئەمە پێوەندی بە تایبەتیی واتای ئەو وشانەوە هەیە و ئەمە ڕێگە لەوە ناگرێ کە لە ڕیزی ئاوەڵناو دابنرێ و وەك ئاشکراشە، وەنەبێ هەموو ئاوەڵناوێك پلەی بەراورد و پلەی باڵای هەبێ .

---

(١) ئا. ئی. سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ١٦٣ .

حاسیەتی واتای لێکسیکی ژمارەی پلەیی ، لەوەشدایە کە دەبێتە بەشە
ئاخاوتنی دی»[2] .

ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا بتوانین ئەو چەند وێکچوونە ڕێزمانی یە
کەمەی نێوان ژمارەی پلەیی و ئاوەڵناو بە بەڵگەی داڵانی ژمارەی پلەیی بە
ئاوەڵناو وەربگرین ، ئەوە بە هیچ چەشنێك ناتوانین ئەو ڕایەی هەندێ
نووسەرانی دی پەسەندبکەین ، کە ژمارەی بنجیش بە ئاوەڵناو
لەقەڵەم دەدەن ... ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا لە نێوان ژمارەی پلەیی و
ئاوەڵناودا کەمێ وێکچوونی ڕێزمانی هەبێ ، ئەوە لە زمانی کوردیدا ئەو
وێکچوونە زۆر کەمترە ، کەچی هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی
لەسەر پەیڕەوی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی چاولێکەریی ئینگلیزی گشت
جۆرەکانی ژمارەیان لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناو داناوە[3] ...وێڕای
ئەوە بڕێکیش لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەبەر ڕووناکیی ڕێزمانی
عەرەبی ژمارەیان بە ناو لەقەڵەم داوە[4]... وا دەردەکەوێ هیچ یەکێك
لەو دوو دەستەیە خاوەنی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی خۆیان نین و
تایبەتێتی زمانی کوردییان نەخوێندووەتەوە .

---

(2) هەمان سەرچاوە ، ل ١٦٣ ــ ١٦٤ .

(3) بۆ نموونە :

أ ــ تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ٧٤ ــ ٧٥ .

ب ــ نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٣٤ ــ ١٣٥ .

...و هەندێکی دی

(4) بەوێنە :

أ ــ سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل ١٢ .

ب ــ ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١١٠ .

...و هەندێکی تر .

له زمانی كوردیدا گرنگیی ژماره له تایبه‌تیی پێكهاتنیدایه • به‌وێنه
بۆ گه‌یاندنی واتای ژماره‌ی شتێك ـ واته كاتێك ژماره له‌گه‌ڵ ناودا دێت :
(پێنج سێو •••) وا باوه كه هه‌ر یه‌ك ڕێگه ده‌گیرێ ، ئه‌ویش ڕێگه‌ی
لێكدانه • له حاڵه‌تی (پێنج سێو •••)دا ، مه‌رج وایه ضه‌ربی پێنج بكرێ :
سێو × ٥

بۆ ده‌ربڕینی ژماره‌كانی زمانی كوردی ڕێگای هه‌مه‌جۆر هه‌یه • ڕێگه‌ی
هه‌ره باو (كۆكردنه‌وه)و (لێكدان)ه •

**★ ـ ڕێگه‌ی كۆكردنه‌وه :**

له ژماره (١١)ه‌وه تا (١٩) ، به‌وێنه ژماره‌ی (چوارده) به‌پێی پێكهاتنی
واتایی برتی‌یه له (چوار + ده) • ئه‌م ڕێگه‌یه هه‌روه‌ها بۆ گه‌لێك له‌و
ژمارانه‌ش به‌كاردێنرێ ، كه له سه‌روو (بیست)ه‌وه‌ن : (بیست و دوو)
واته (٢٠ ٢) ؛ (چل و شه‌ش) ـ واته (٤٠ + ٦) •••

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ، پێویسته سه‌رنج بۆ ئه‌وه‌ش ڕابكێشین ، ڕێگه‌ی
كۆكردنه‌وه‌ی ژماره‌كانی وه‌ك (بیست و دوو) ؛ (چل و شه‌ش) ••• هه‌ندێ
جیاوازی له‌گه‌ڵ ڕێگه‌ی كۆكردنه‌وه‌ی ژماره‌كانی وه‌ك (چوارده)دا هه‌یه •
ژماره‌ی وه‌ك (بیست و دوو) ؛ (چل و شه‌ش) •• به‌یاریده‌ی (و)ه‌وه
پێكه‌وه به‌ستراون • چۆن ده‌شێ وا بیربكرێته‌وه كه وشه‌ی لێكدراون و له
دوو ژماره پێكهاتوون و به یاریده‌ی ئاوبه‌ندی (و) پێكه‌وه به‌ستراون .
هه‌روه‌ها ده‌لوێ وا لێك‌بدرێته‌وه ، كه وشه‌ی لێكدراو نه‌بن و دوو
وشه بن و (و)ی پێوه‌ندی له نێوانیاندا هه‌بێ • هه‌رچی بۆ ژماره‌كانی
جۆری (چوارده)یه . چۆن ده‌شێ وا بیربكرێته‌وه كه وشه‌یێكی
لێكدراوه و له دوو ژماره بێ یاریده پێكهاتبێ ، هه‌روه‌ها ده‌لوێ بوترێ كه
به‌شی دووه‌می ئه‌و وشه ناساده‌یه شتێكه له نێوان وشه و پاشگردا •

به‌ڵام خاسیه‌تی ژماره‌ی وه‌ك (بیست و دوو) وه‌ك وشه‌ی كۆكراوه
له ڕووی پێكهاتنی واتاوه جیاوازی له‌گه‌ڵ ناوی كۆكراوه‌دا زۆره •
ئه‌و جیاوازیه‌ش له‌وه‌دایه ، كه وا ژماره‌ی وه‌ك (بیست و دوو) له‌سه‌ر

بناغەی کۆکردنەوە پێك‌دێ ، بەڵام پێکهاتنی ناوی کۆکراوە لەسەر بناغەی کۆکردنەوە بە ئەنجام ناگەیەنرێ . بەوێنە (کۆبوونەوەی خێزان) لەباری واتاوە ، ئەوە ناگەیەنێ کە لە (کۆبوونەوە + خێزان) سازبووبێ .

★ ڕێگای لێکدان :

هەرچی ژمارەی وەك (دووسەد) ؛ (چوارهەزار) .... لە ڕێگای لێکدانەوە سازبووە – واتە : (٢ × ١٠٠) ؛ (٤ × ١٠٠٠) .. لێرەشدا ئەگەر لەگەڵ لێکدانی ناودا بەراوردی بکەین ، هەندێ جیاوازی بەدی دەکەین ...

بەو چەشنە بۆ گەیاندنی واتای ژمارە لە سیستەمی بەشە ئاخاوتنی ژمارەدا ڕێگەی ئەوتۆ بەکاردێنرێ ، کە لە سیستەمی بەشە ئاخاوتنی ناودا بەکارناهێنرێ . ئەم تایبەتێتیيانەش خاسیەتی ژمارە دیاری‌دەکەن و وەك بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ جیای‌دەکەنەوە و نیشبانی ئەوە دەدەن ، کە ڕاست نییە بخرێنە بەشە ئاخاوتنی ناوەوە .

وەك پێشتر وتمان هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی . بەپێی پەیڕەوی‌کردنی نووسەرانی ڕێزمانی ئینگلیزی ژمارەیان بە ئاوەڵناو داناوە. ڕاستە لە زمانی ئینگلیزیدا لە یەکەم سەرنجدا ڕەنگە وا بێتە پێش‌چاو . کە هاتنی ژمارە لەگەڵ ناودا . وەك « two boys – دوو کوڕ» جیاوازی لەگەڵ هاتنی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا – « -little boys کوڕی بچووك» نەبێ ... بەڵام ئەگەر قوول لەو مەسەلەیە وردبینەوە. بە ئاسانی هەست بەوەدەکەین ، کە لە نێوان ژمارەو ئاوەڵناودا جیاوازی زۆرە . ئەو جیاوازییەش بە ڕوونی لە پێوەندیی واتای پارچەکانی ژمارەی پێکەوەبەستراو و پێوەندیی واتای پارچەکانی ئاوەڵناوی پێکەوەبەستراو بەدەردەکەوێ[٥] . وەك پێشتر وتمان بۆ پێکهێنانی ئەو جۆرە ژمارانە .

(٥) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی . ئا . سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، ل ١٦٧ .

دوو ڕێگەی (کۆکردنەوە) و (لێکدان) باون . بەڵام هەرچی پێوەندیی واتای پارچەکانی ئاوەڵناوی پێکەوەبەستراوە . لەسەر بناغەی ئەو دوو ڕێگەیە سازناکرێت . بەوێنە ، کە دەوترێ (شینی کاڵ) هیچ ئەوە ناگەیەنێ کە لە (شین + کاڵ) یاخود (شین × کاڵ) پێکهاتبێ .

٨ هەروەها جیاوازی لە بوونی ژمارە بە ناو و بوونی ئاوەڵناو بەناویشدا زۆرە . ئەمانە و هەندێ لایەنی دی هەن ، کە بلێین ، بڕێ لە نووسەرانی ڕێزمانی ئینگلیزی ڕاست نین ، کە ژمارەیان خستووەتە ناو بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوەوە . هەرچی هەندێ نووسەری ڕێزمانی کوردیشە ، کە لاسایی زمانی ئینگلیزی کردووەتەوە ، ئەگەر گوێ نەدەینە دەرلێکنەکردنی بەو جیاوازییانەی لە زمانی ئینگلیزی و زۆر زمانی دیدا لە نێوان ژمارە و ئاوەڵناودا هەیە و کە بەشێکیمان لەسەرەوە باس کرد ، خۆ دەبوو هەست بەوە بکا کە لە ڕستەی کوردیدا ئاوەڵناو بەدوا ناودا دێت : (ژنی جوان) ... ; بەڵام هەرچی ژمارەیە دەکەوێتە پێش ناو : (چوار ژن) ...

٩ لە ڕووی ڕستەسازییشەوە ژمارە بە شێوەیێکی سەربەخۆ خۆی دەنوێنێ ... ڕاستە وەك ئاوەڵناو بە زۆری لەگەڵ ناودا دێت و ئەم پێکەوە هاتنەش ، پێکەوە هاتنی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا دێنێتەوە یاد (پێنج گوڵ) ; (گوڵی سوور) ... ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، لەو جۆرە بەکارهێنانەدا ناشێ ژمارە ناوبنرێ دیارخەر ، بەڵام هەرچی ئاوەڵناوەکەیە ، لەبەر ئەوەی خاسیەتی شتێك دەردەخا دەبێ بە دیارخەر . لە دەستەواژەی (پێنج گوڵ) ، ژمارە دەورێکی تایبەتی دەبینێ و خاسیەتی شتێك ئاشکرا ناکا ، بەڵکو تەنیا ئیشارەت بۆ چەندێتی شتێك دەکا .

ژمارە لە ڕووی وشەسازییەوە خاوەنی ئەم خاسیەتانەیە :

١ – تەنیا لەگەڵ ئاودا دێ و پارچەکانی ئەو جۆرە دەستەوازانەش بەپێی دەستووری ڕستەسازی دابەش ناکرێن و سەرپاکیان بەسەریەکەوە دەبنە ئەندامێکی ڕستە ، وەك : «دوو ڕۆژ ؛ چوار کچ ، شەش مەڕ...».

٢ – ناتوانێ گاوەڵناو دیاری بکا[٦] .

مەفهوومی ژمارە لە ئەنجامی مێژووییکی درێژی پێشکەوتنی ئادەمیزادەوە پەیدابووە . ف . ئینگیلس دەڵێ : «مەفهوومی ژمارە و ئەنەکان لە شوێنێکی ئادیارەوە وەرنەگیراوە ، بەڵکو لە واقیعی دەوروبەرەوە هاتووە» ... «دە پەنجە ، کە مرۆڤ لەسەری فێری ژماردن دەبوو – واتە یەکەم عەمەلیەی حیسابی دەکرد»[٧] لە کاتی ژماردندا توانستی لادان لە شتی دیاریکراو (برێتیە لە ئەنجامی پشت بەستنی دوورو درێژ بە تەجروبەی پێشکەوتنی مێژوویدا) . بۆ نموونە ، وشەی «پێنج ، دە ، سەد ...» دەشێ بۆ هەر شتێك بەکاربهێنرێ کە بژمێررێن . بەوێنە : پێنج پیاو ، پێنج مریشك ، پێنج بەرد ، پێنج شەقام ، پێنج باوەڕ ... هتد . ئەمەش ئەنجامی گشتیبوون و تەجرید بوونە[٨].

* * *

نووسەرانی ڕێزمانی کوردی و زمانانی دی ، کاتێ لە ڕووی تایبەتیتی واتا و چۆنێتی بەکارهێنانەوە ژمارە دابەش دەکەن بەسەر جۆری جیاوازدا ، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دابەشکردنەکانیاندا بەدی دەکرێ . بەوێنە

---

(٦) ن. س. ڤالگینا ، د. ن. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ف. ڤ. تساپکێفیچ ، زمانی ڕووسی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢١٥ – ٢١٦ .

(٧) ئا. ئی. گولانۆڤ ، وشەسازیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٢٥ .

(٨) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢٦ – ١٢٧ .

هەندێ نووسەر ژمارەی کەرتی (کەسری) بە جۆرێك لـە ژمارە دادانێن ؛ برێك ژمارەی پلەیی (تەرتیبی ، ڕوتبەیی) نـاخەنـە نێو بـەشە ئـاخـاوتنی ژمارەوە ••• بەپێچەوانەشەوە نووسەری وا هەیە تەنانەت ئـاوەڵکرداری (یەك‌یەك ، دوودوو ،سێ‌سێ •••)و وشەی چەندێتی نادیاری وەك (زۆر ، کەم •••)یش بە چەشنەکانی ژمارە لە قەڵەم دەدەن •

لە ڕێگەی هەڵسەنگاندنی ئەو کارانەی لـە مەیدانی لێکـۆڵینـەوەی (ژمارە)دا کراون و بە پێی بۆچوون و لێکدانەوە و توێژینەوەی تـایبـەتیی خۆمان و بەهۆی کەڵك وەرگرتن لە تیۆریی زمانناسی‌یەوە ، گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامەی لە زمانی کوردیدا سێ جۆر ژمارە دیاری‌بکەین :

١ ـ ژمارەی بنجی •
٢ ـ ژمـارەی پلـەیی •
٣ ـ ژمـارەی کـەرتی •

١ ـ ژمارەی بنجی :

ژمارەی بنجی کە دەشێ ژمارەی چەندی‌یشی پێ بوترێ ، ئەو ژمارانە دەگرێتە خۆ ، کە وا بەگشتی لە تـەواوی دانـەکانـدا تـەجریـدی ژمـارە ڕادەگەیەنێ (دوو کەرەت دوو چوار) ، یان ژمارەی دیـاری‌کـراوی شتی هاورەگەز نیشان دەدا (شەش کتێب)•••

تایبـەتێتـی وشـەسـازیـی ژمـارەی بنجـی پێـوەنـدە بـە واتـا لێکسیکی‌یەکەوەی • ژمـارەی بنجی خـاوەنی حـاڵەتی تـاك و کـۆ[٩] و ناسیاوی ••• نی‌یە ، چونکە لە مانایدا ئەو دیاردەیە هەیە • ژمـارەی بنجی هەروەها دۆخی‌یشی نی‌یە ، چونکە واتای شت ناگەیەنێ • نەبوونی حاڵەتی تاك و کۆ و ناسیاوی و دۆخ بەشە ئاخاوتنی ژمارە لـە بـەشـە ئـاخـاوتنی

(٩) ڕاستە هەندێ ژمـارە،وەك ( دە ، سـەد ، هـەزار ••• ) نیشـانـەی (ـان) یان (ـەها)ی کۆ وەردەگرن و دەوترێ : ( دەیـان ، سـەدان ، هەزاران ••• ) یان (دەها ، سەدەها ، هەزارەها ••• ) ، بەڵام بۆ ئەمە دوو تێبینی دەخەینە بێش‌چاو :
١ ـ وەرگرتنی نیشانەی کۆ لە لایەن ژمارەوە دەستوورێکی گشتـی نی‌یە و ئەو ژمارانەی نیشانەی کۆ وەردەگرن زۆر کەمن • =

ناو جیادەکەنەوە • بەپێی پێوەندیی وشەڕۆنان لە نێو ژمارەی بنجیدا ، وشەکانی : یەك ، دوو ، سەد ، هەزار ••• پتر دیار و چالاکن •

ژمارەی بنجی ئەگەر بەبێ ناو بەکاربهێنرێ ، ئەوە تەنیا ناوی ژمارەیێك ڕادەگەیەنێ ، بەڵام کە لەگەڵ ناوێکدا دێت ، ئەوە دەتوانی بێتە دیارخەری چەندێتی ناوەکە و ناوەکەش دەبێتە دیارخەری ژمارەکە: (یەكدار ؛ هەزار منداڵ)• ژمارە لەم بارەدا نە دەبێ بە ئاوەڵناوو نە دەشتوانێ ببێ بە دیارخەری ئاوەڵناو • ئاوەڵناویش نابێ بە دیارخەری شتی ژمارەکە •

تایبەتێتی ژمارەی بنجی لەنووسیندا ئەوەیە ، کە دەشێ بە ڕەقەمیش دەرببڕرێ ، وەك (چل ـ ٤٠) ، (سەد ـ ١٠٠) ، بەڵام هەرچی ئەو ناوانەیە، کە واتای چەندێتییان تێدایە ، وەك : (چلە) ، (حەفتە) ، (سەدە) ••• ناشێ بە ڕەقەم نیشان بدرێن • ئاوەڵناو دەتوانێ ببێتە دیارخەری ناوی چەندێتی ، بەڵام ناتوانێ ببێ بە دیارخەری ژمارەی بنجی •

وشەی «یەك» ، جگە لە واتای چەندێتی ژمارە : (یەك ساڵ ؛ یەك ژن •••) ، دەتوانێ واتای دیش بگەیەنێ • بۆ نموونە :

---

٢ ـ ژمارەکانی (دە ، سەد ، هەزار ... ) ، کاتێ نیشانەی کۆ وەردەگرن ، دوو گۆڕانی بنەڕەتییان بەسەردا دێت :

أ ـ واتای چەسپیویان نامێنێ ـ واتە لە چەندێتی دیارەوە دەبنە چەندێتی نادیار . بۆ نموونە کە دەوترێ ( سەد پیاو) ، ئەوە مەبەست (سەد پیاو)ە بێ کەم و زیاد ، واتە نە (٩٩)ن و نە (١٠١)ن ، بەڵام کە دەوترێ (سەدان پیاو) ، ئەوە چۆن دەشێ (چوارسەد) بن ، دەشێ (هەشت سەد)یش بن ...

ب ـ لە بەشە ئاخاوتنی ناو نزیك دەبنەوە ...

هەچی ژمارەی (دوو ، سێ)یشە ، تەنیا دەمێ دەتوانن (ان) وەربگرن ، کە ناوەکە لابرێ و جێی بگرنەوە . وەك :

دوو پیاو هاتن     دوان هاتن
سێ پیاو هاتن     سیان هاتن

(١) به واتای ناو ، وەك «یەك لە ئێمە دەرناچێ» ب/ (٢) بە واتای جێناو ـ ئاوەڵناو ، وەك «ئێمە پێكەوە یەك فوتبابخانەمان تەواوكردووە» ؛
(٣) بە واتای جێناوی نادیار ، وەك «منو ئازاد لە یەك ڕێگاوە هاتووین»..
وشەی «هەردوو ، هەرسێ ..» لە ژمارەی بنجی «دوو ، سێ..»وە نزیكنو هەرهەمان ئەندازە ڕادەگەیەنن، بەڵام واتای بنەرەتیی «هەردوو، هەرسێ ...» ڕاگەیاندنی چەندێتی نییە ، بەڵكو تەنیا پەنجە بۆ نیشاندانی چەندێتی ڕادەكێشێ . وشەی «هەردوو ، هەرسێ...» ناكەونە نێو بەشە ناخاوتنی ژمارەوە ، بەڵكو سەر بە جێناون . ئەم جێناوانەش كە لە ژمارەی بنجی و جێناوی «هەر» پێكهاتوون ، واتای كۆكردنەوە دەگەیەنن ، وەك :
هەردوو ژنەكە ڕۆیشتن .
هەرسێ كتێبەكەم خوێندەوە .
لە زمانی كوردیدا ژمارەی بنجی كاتێ چەندێتی ناوێك (سادە بێ یان ناسادە) ڕادەگەیەنێ ، لەپێش ناوەكەوە دێت . هەرچی ناوەكەشە لە شێوەی تاكدا بەدەردەكەوێ (كەمێ جاریش لە شێوەی كۆدا ، ئەویش جگە لە ژمارەی «یەك»)[10]. وەك :

---

(١٠) شایانی باسە ، د. زارێ یووسف باسی ئەو تایبەتێتییەی ژمارەی بنجی كردووە (بڕوانە : دیالێكتی سلێمانی زمانی كوردی ، مۆسكۆ ، ١٩٨٥ ، ل ٦٥) . مامۆستا تۆفیق وەهبییش لەو تایبەتێتییە دواوە ، بەڵام جیاوازی لەوەدایە ، ئەم وا دادەنێ ، كە « ناوەكە هەمیشە تاك ئەمێنێتەوە » (دەستووری زمانی كوردی ، جزمی یەكەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ . ل ٧٤ ) .
لە زمانی فارسیی ناوەڕاستیدا ناو كە لەگەڵ ژمارە دێت ، بە زۆری لە شێوەی تاكدا بەدەردەكەوێ . وەك :
دۆ ژەن — دوو ژن
هەفت كیشفەر ــ حەوت وڵات
ناوەناوەیەكیش ناوەكە لە فۆرمی كۆدا بەدەردەكەوێ . وەك :
دو ڤازدەھ ئەختەران ــ دوازدە ئەستێرە
( بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگوێڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسكۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٧٥ ــ ٧٦ ) .

لای چەپی ژوورەکەیش دوو پەنجەرەی گەورە هەبوو
(نەخەوما ، ل ٤٤)

ئازاد تەمەنی چوار ساڵە / ئازاد تەمەنی چوار ساڵانە[11]

ئەگەر ناوەکە بە ناو تەواو کرابێ ، ژمارەی هەر کامێکیان مەبەست بێ ، ئەوە ژمارەی بنجی دەخرێتە پێش ئەو ناوەوە[12] . وەك :

**چوار دەرگای ماڵ**

**دەرگای چوار ماڵ**

**پێنج چرای کۆڵان**

**چرای پێنج کۆڵان**

ژمارەی (یەك) زۆر جار لەگەڵ ناودا لە شێوەی نیشانەی (ـ یێك / ـ ەك)دا دێت ، وەك :

| | |
|---|---|
| بزێك | بزنەك |
| نوانێك | نوانەك |
| ساڵێك | ساڵەك |

ژمارەی بنجی کە ژمارەی ناوێك ڕادەگەیەنێ ، دەشێ ناوەکە بێ هیچ نیشانەیێك بێ و دەشلوێ نیشانەی لەگەڵ بێ . بۆ نموونە :

۱ ـ بێ نیشانە :

**سێ پیاو**

**چوار ژن**

---

(11) لە ڕاستیدا ئەو ناوانەی ئەندازەی کاتیان تێدایە ، وەك (سەعات ، ڕۆژ ، شەو ، مانگ ، ساڵ ...) ، کاتێ لەگەڵ ژمارەی بنجیدا بەکاردێنرێن ، دەتوانن قاڵبی کۆ وەربگرن . وەك : دوو شەوان (دوو شەو) ؛ حەوت ساڵان (حەوت ساڵ) ... (بڕوانە : ك. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆفا ، دیالیکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ۱۹٦۸ ، ل ١٥٤ .

(12) مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەو تایبەتێتی‌یەی یادداشت‌کردووە (بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ۱۹۲۹ ، ل ۷٤ـ۷٥).

پێنج قوتابی

٢ ـ لەگەڵ ئیشانەکاندا :

أ ـ (ەکە)ی ناسیاوی :

سێ پیاوەکە ڕۆیشتن •

چوار ژنەکە هاتن •

ب ـ (ە)ی ناسیاوی :

سێ پیاوە کەوتنە ڕێ •

چوار ژنە لە کاتی گەڕانەوە •

ج ـ (ان)ی کۆ :

چوار ڕۆژان بەبێ ڕۆیشتن

د ـ (ێک)ی نەناسیاوی :

سێ ڕۆژێك لەمەوبەر •

تێبینی :

١ ـ ئەگەر ژمارە بنجییەکە (یەك) بێ ئەوە ناوەکە ناتوانێ هیچ یەکێك لەو ئیشانانە وەربگرێ •

٢ ـ کاتێ ناوی دوای ژمارەکە نیشانەی (ێك)ی نەناسیاوی دەچێتە سەر ، ئەوە ژمارەکە واتای نزیکی (تەقریبی) لە خۆیەوە وەردەگرێ • بۆ نموونە ، کە دەوترێ «سێ ڕۆژ» ، ئەوە گومان لە ژمارەی «ڕۆژ»ەکاندا نییە و ئاشکرایە و دیاری کراوە ، کە بێ زیاد و کەم «سێ»ن • بەڵام کە دەوترێ «سێ ڕۆژێك» ، مانای وایە نزیکەی «سێ ڕۆژ» • جا دەشێ لە سێ زیاتر بێ یان کەمتر • لەم بارەدا ژمارەی «سێ» واتای جەمپیاوی لەدەست دەدات •

٣ ـ هەم واتای نزیکی ئەم ژمارە لەو بارەشدا دەخرێتە ڕوو کە لە پێش ژمارەکەوە وشەی (نزیك ـ نزیکەی ـ نزیکی ... دەوروبەری...)بێت •

حالـەتـەشـدا دەشێ نـاوەکـە نیشانـەی (ێـك)ی پێـوە بـێ یـان یوە نەبێ وەك :

نزیکەی سێ ڕۆژ لەمەوبەر

نزیکەی سێ ڕۆژێك لەمەوبەر

دەوروبەری سێ ڕۆژ لەمەوبەر

دەوروبەری سێ ڕۆژێك لەمەوبەر

٣ ـ ئینجا ناوەکە لابرێ ، ئەوە ژمارەکە نیشانەی (ـ ەکە) و (ـ ە) و ـ ان) وەردەگرێ و دەوری ناو دەبینێ ، وەك :

چوارەکە هاتن

چوارە کـەوتـنـەڕێ

سیـان ڕۆیشتـن

٤ ـ ژمارەی «یەك» کە دەوری ناو دەبینێ ـ واتـە کـاتێ نـاوەکـە لادەبرێ ـ نیشانەی (ـ ێ ، ـ ێك)ی ئەناسیـاوی پێـوە دەلکێ ، وەك

یەکێ (یەکێك) لەو وێنانە هەڵدەبژێرم .

یەکێ (یەکێك) هاتە ژوورەوە[13]

* * *

لە زمانی کوردیدا لە (یەك)ەوە تا (دە) ـ «یەکان» ؛ لـە (دە)وە تـا (سەد) ـ «دەیان» ؛ لە (سەد)ەوە تا (هەزار) ـ «سەدان» ، لە (هەزار)ەوە تا ملیۆن ـ «هەزاران»یان پێ دەوترێ[14] .

ناوی یەکەم دە ژمارەی زمانی کوردی بەم چەشنەی خوارەوەیە.

---

(13) د. زاری یوسف لە کتێبی «دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی» ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥دا لە بەشی زۆری ئەو تایبەتێتیانەی ژمارەی پێچی دواوە (ل ٦٥ ـ ٦٦ )

(14) شایانی باسە ، مامۆستا سەعید صدقي کابان ئەوەی یادداشت کردووە (مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل ١٣ )

له زمانی بلووجیـدا «دۆ ، دو»ه ؛ لـه زمـانی هیندی نـوێـدا «دو»ه ؛
له زمانی ئیـنگلیزیدا «تو»ه ؛ له زمانی لاتینی‌دا « onp »ه ؛ له زمانی فەرەنسیدا «دوێ»ه ؛ له زمانی ڕووسیدا «دڤا»یه ...

ژمارەی «سێ»ی کوردی له زمانی ئاوێستادا لـه شێـوەی «تـری . ترەی» دایه و له هیندی کۆندا «تـری ، تیسـر»ه ؛ لـه زمـانی فـارسیی ئاوەڕاستدا «سێ . Si ...» له زمانی فارسیی نوێدا «سه»یه ؛ له زمانی کوردیدا «سێ»یه ؛ له زمانی بلووجیدا «سەی»ه ؛ له زمانی هیندی نوێدا «تین»ه ؛ له زمانی ئینگلیزیدا «ثری»یه ؛ له زمانی لاتینی‌دا « tres »یه؛ له زمانی فەرەنسیدا «تـروا»یـه ؛ لـه زمـانی ڕووسیـدا «تری»یـه و لـه بولگاریشدا هەر «تری»یه ...

بەرانبەر وشەی «چوار»ی کوردی له زمانی ئاوێستادا «چـەتـور ، چەتڤار» دەبینین ؛ له زمانی هیندی کۆندا «چەتڤار» ؛ لـه زمانی فـارسیی ئاوەڕاستدا «چەهار» ؛ لـه زمانی فـارسیی نوێـدا «چـار» ؛ لـه زمـانی بلووجیدا «حار» ؛ له زمانی ڕووسیدا «چیتری» ؛ له زمانی هیندی نوێـدا «چار» ؛ له زمانی لاتینی‌دا «quattuor» ؛ له زمانی فەرەنسیدا «کاتر »...

بۆ وشەی «پێنج»ی کوردی له زمانی ئاوێستادا «پەنجه» دەبینین ؛ له زمانی هینـدی کۆندا «پـەنجـه» ؛ لـه زمانی هیندی نـوێدا «پانچ» ؛ له زمانی فارسیی ئاوەڕاستدا «پەنج» ؛ له زمانی فارسیی نوێـدا «پنج» ؛ له زمانی بلووجیدا «پەنج ، پەچ» ؛ له زمانی ڕووسیدا «پیات» ....

وشەی «شەش»ی کوردی لـه زمانی ئـاوێستـادا «خشـشـەش»ه ؛ له زمانی هیند و ئێرانیدا «سقـەکس» ؛ له زمانی هیندی کۆندا «شـاش» ؛ له زمانی فارسیی ئاوەڕاستدا «شەش» ؛ له زمانی فارسیی نوێدا «شش» ؛ له زمانی بلووجیدا «شەش» ؛ لـه زمانی ڕووسیدا «شێست» ؛ لـه زمانی بولگاریـدا «شێـست» ...

هەروەها ی «حەوت»ی کوردی لە زمانی ئاوێستادا «هەپتە»یە ؛ لە زمانی هیندی کۆندا «سەپتە»یە ، لەزمانی هیند و ئەوروپایی‌دا «سەپتم»ە ؛ لە زمانی فارسیی ئاوەڕاستدا «هەفت» ە ؛ لە زمانی فارسیی نوێدا «هفت»ە ؛ لە زمانی بلووجیدا «هەپت»ە ؛ لە زمانی لاتینی‌دا «Septem»ە ؛ لە زمانی فەرەنسی‌دا «سیت»ە ؛ لە زمانی ڕووسیدا «تێم»ە ....

ژمارەی «هەشت»ی کوردی لە زمانی ئاوێستادا لە شێوەی «ئەشتا» دایە ؛ لە زمانی هیندو ئەوروپایی‌دا «ئوکتۆ»یە ، لە زمانی هیندی کۆندا «ئەشتە»یە ؛ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا «هەشت ، ئەشت»ە ؛ لە زمانی فارسیی نوێدا «هشت»ە ؛ لە زمانی بلووجیدا «هەشت ، هەژدە»ە ، لە هیندی نوێدا «ئەت»ە ، لە زمانی ئینگلیزیدا «ئەیت»ە....

بەرانبەر وشەی «نۆ»ی کوردی ئەمانە دەبینین : لە زمانی ئاوێستادا «نەڤە» ؛ لە زمانی هیندو ئەوروپایی‌دا «نیوم» ؛ لە زمانی هیندی کۆندا «نەڤە» ؛ لەزمانی فارسیی ناوەڕاستدا «نەه،نوه»؛ لەزمانی فارسیی نوێدا «نه» ؛ لە زمانی بلووجیدا «نوه» ؛ لە زمانی هیندی نوێدا «نەو» ، لە زمانی لاتینیدا « Novem » ؛ لە زمانی فەرەنسیدا «نۆف» ؛ لە زمانی ئەڵەمانیدا «نوێن» ؛ لە زمانی ئینگلیزیدا «ناین» ؛ لە زمانی ئیتالیدا «نۆڤی» ...

هەرچی وشەی «دە»شە وێنەی لەم شێوانەدا بەدی دەکرێ : لە زمانی ئاوێستادا «دەسە» ؛ لە هیند و ئەوروپایی‌دا «دەکم» ؛ لە زمانی هیندی کۆن «داسە» ؛ لە زمانی هیندی نوێدا «دس» ؛ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا «دەه» ؛ لە زمانی فارسیی نوێدا «دەه» ؛ لە زمانی بلووجیدا «دەه» ؛ لە زمانی لاتینیدا « Decem » ؛ لە زمانی فەرەنسیدا «دیز» ، لە زمانی ئیتالیدا «دیتشی» ؛ لە زمانی ڕووسیدا «دێست» ؛ لە زمانی بولگاریدا «دێسەت» ...

له بەراوردکردنی فۆرم و ناوی ژمارەی یەك تا دەی کوردی لە...
فۆرم و ناوی ئەو ژمارانەدا لە زمانی ئاوێستا و هیند و ئەو زمانانە
کۆن و نوێ و ئێرانیی کۆن و ناوەڕاست و نوێدا نزیکییەکی زۆر لە
نێوانیاندا دەبینرێ ، ئەم جۆرە نزیکییە تەنانەت دەشێ
ناوبنرێ یەکێتی و وێکچوون . «هەرچەندە لە نێوان ئەو زمانانە
خزمایەتیی تەواو هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا
لە مەسەلەی پێشکەوتنی دەنگسازیدا هەر یەکەیان خاوەنی یاسای تایبەتی
خۆیانن»[١٦]. بۆ نموونە وشەی «دقە»ی ئاوێستا لەگەڵ «دقا»ی زمانی
هیندی کۆن و زمانی ڕووسیی ئەمڕۆدا جیاوازییان تەنیا لە دەنگی (ە) و
(ا)ی کۆتاییاندایە . هەر ئەو (ە)یەی کۆتایی «دقە»ی ئاوێستا لە زمانی
فارسیی ناوەڕاستدا بووە بە (ۆ) و لە زمانی کوردیدا بە (وو) و لە زمانی
فارسیی نوێدا بە (و) ... یاخود وشەی «دەسە»ی ئاوێستا لە زمانی
هیندی نوێدا تەنیا دەنگی (ە)ی کۆتایی سواوە و بووە بە (دس) ، بەڵام
لە زمانی کوردیدا تەنیا بڕگەی یەکەمی - (دە) ماوەتەوە و بڕگەی
دووەمی - (سە) تێداچووە[١٧] ...

---

(١٦) ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ،
مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣٤ .

(١٧) مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی ئەوەی یادداشت کردووە ، کە « تا
ئێستاش لە ناوچەی هەوراماندا ، (دەسە) بە واتای (دە) بۆ ژمارە لە
هەر ماوە و بلاوشە ، بەتایبەتی بۆ ژماردنی (گوێز)ـە .
بۆ وێنە دەوترێ :
(دە دەسە گوێز ) ، واتا : (سەد گوێز)
(سەد دەسە گوێز ) ، واتا : (هەزارێ گوێز ) » .
(بڕوانە : محەمەد ئەمین هەورامانی ، فەرهەنگی ئێریەن ئاج ، بەغدا
١٩٨٧ ، ل ١١٠ ) .

| کرمانجیی خواروو | | کرمانجیی ژووروو | |
|---|---|---|---|
| زمانی ئەدەبی | شێوە جیاوازەکانی | زمانی ئەدەبی | شێوە جیاوازەکانی |
| ١١ ـ یازدە | یانزە ، یانگزە ، یانزدە | یانزدە (ھ) | دەھیەك |
| ١٢ ـ دوازدە | دوانزە، دوانگزە، دوانزدە | دۆزدە (ھ) | دەھدو |
| ١٣ ـ سیازدە | سیانزە ، سیانگزە | سێنزدە (ھ) | دەھسێ |
| | سیانزدە ، سێزدە | | |
| ١٤ ـ چواردە | چاردە | چاردە (ھ) | دەھچار |
| ١٥ ـ پازدە | پانزە ، پانگزە ، پانزدە | پانزدە (ھ) ، پەنجزدە (ھ) | دەھپێنج |
| ١٦ ـ شازدە | شانزە ، شانگزە ، شازدە | شانزدە (ھ) | دەھشەش |
| ١٧ ـ حەڤدە | حەڤڤە | حەڤدە (ھ) | ھەفتدە (ھ) ، دەھحەفت |
| ١٨ ـ ھەژدە | | ھێژدە | دەھھەیشت |
| ١٩ ـ نۆزدە | | نۆزدە (ھ) | دەھنە (ھ) (١٨) ، (١٩) |

(١٨) ق. کوردۆ (کوردۆیێڤ) ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی ←

له ژماره (١١)ەوه تـا (١٩) به لێکدانی ژمارەی یـەکان (بە هـەندێ گـۆڕانـەوه) لەگـەڵ ژمـارەی ده (دەه) سازدەبن ، وەك :

---

دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٨٧ .

(١٩) مامۆستـا چەرکـەزی بەکـۆ وا ڕادەگەیـەنێ ، کە لـە نێو کوردەکـانی ئازربایجاندا بەتایبەتی لە نێوان بەساڵاچووەکاندا ، ژمارەی (١١) تا (١٩) بەم شێوەیەش دەبینرێ :

١١ ـ ده و یەك

١٢ ـ ده و دوی

.. .. ..

١٩ ـ ده و نەه

به زۆریش (د)ی سەرەتای (ده) دەکەنە (ت)و دەڵێن : تە و یەك تە و دوی ... تە و نەه (بڕوانە : چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٢٨ .

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانیش ئەوەی ڕوونکردووەتەوە ، کە «لە ناو هەندێ ناوچەدا ، ناوچەی کوردەواری ، بەتایبەتی لـە نـار ئافرەتاندا ، (ده و یەك ، ده و دوو ، ده و سێ) بۆ مەبەستی (یانزه) ، (دوانزه) ، (سیانزه) بەکاردێ » (بڕوانە : محەمەد ئەمیـن هەورامانـی ، فەرهەنگی ئێریەن ڤاج ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ٧٢ ) .

سوانی (د)ی ئەم ژمارانەش ، هەروەك سوانی (د)ی هەندێ وشـەی دی لە ساڵانی پێستدا لـە گـەڕدا بـوو . بـەڵگـەش ئەوەیـە ، کـە ...

سوان و بێچوونی (د) ڕوونکردنەوە و لێکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ ، چونکە لە زۆر شوێنی وشەدا دەفرتێ . بەوێنە ئەمڕۆ لە هەندێ شوێنی کوردستاندا ، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانیدا دەنگی (د)ی ژمارەکانی (یازدە ، سیازدە ، پازدە ، شازدە . حەڤدە) سواوە و دەوترێ (یانزە ، دوازە ، سیانزە ، پانزە ، شانزە ، حەفقە) . لەبەر ئەوەی فووتدانی ئەم (د)ە بووە بەهۆی قورسی دەربڕینی ئەو وشانە ، بۆیە بۆ سووککردنی ئەو ناڵەبارییە ناچار بووە دەنگی (ن) بێنێتە ناو (یازە ، دوازە ، سیازە پازە ، شازە)وە و (ق)ی (حەڤە)ش دووبارەبکاتەوە[٢٠].

ئەسڵی ئەو وشانە کە (یازدە ، دوازدە ، سیازدە ، پازدە ، شازدە حەڤدە)ن ، بێگومان چ بۆ نووسین و چ بۆ زمانی ئەدەبی ڕاست وایە پەیڕەوی ئەسڵەکەیان بکرێ . شایانی باسە کۆڕی زانیاری کوردیش لەو ڕایەدا بووە ، کە دەڵێ «ئەسڵی ئەو ژمارانە لە نووسیندا بپارێزرێت»[٢١] . چاپەمەنییەکانی ئەو سەردەمەدا شێوەی جیاوازی بەکارهێنانیان ـ واتە نەسوان ـ دەبینرێ [٢٢] .

---

(٢٠) شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەمەد بە شێوەیێکی زانستی و بەڵگەی زۆر و ڕاست و لەبار دەربارەی چۆنیەتی نووسینی ژمارەکان دواوە ( بڕوانە : مەسعوود محەمەد ، چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٤١ ـ ٣٤٤ .

(٢١) کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٧٠ .

(٢٢) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل ١٢٢ـ١٢٣ .

له زمـانی ئاوێستادا نـاوی ژمـارەکان لـە (١١)موە تاکـو (١٩) بـە لێکدانێکی ئاسایی سازدەبێ ، ئەمەش بەڵگەیەتی :

پـەنچـەدەسـە (پـازدە)

خشفەش‌دەسە (شازدە) (٢٣)

واتـە نـاوی ژمـارەی یەکـان + دەسـە .

له زمانی کوردیدا ئەگەرچی لەم پێکهاتنەدا هەندێ گۆڕان له نـاوی بەشێ لـە ژمـارەکانـدا ڕووی داوە ، بـەڵام هـەمان بنـەما و دەستـوور بـەکـاردێنـرێ . بـەوێنـە :

چـــوار + دە = چـــواردە

هـەشـت + دە = هـەژدە

نـۆ +ز + دە = نۆزدە

له زمانە ئێرانی‌یەکانی دیشدا ، هەروەك زمـانی ئـاوێستـا و زمـانی کوردی ، ناوی ژمارەکانی نێوان (١١) و (١٩) دیسان له یەکگرتنی نـاوی ژمارەی یەکان و ناوی ژمارەی (١٠) سازدەبێ ، لەگەڵ هـەندێ گـۆڕانی فۆنەتیکی‌دا . بەوێنە

(٢٣) س. ن. سوکولوفا ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکو ، ١٩٦٠ ل ٧٠

| فارسیی ناوەڕاست | فارسیی نوێ | بلووچی |
| --- | --- | --- |
| ١١ ـ یازدەھ | یازده | یازدەھ |
| ١٢ ـ دوۋازدەھ | دوازده | دوازدەھ |
| ١٣ ـ سێزدە | سیزده | سێزدەھ ، سێنزدەھ |
| ١٤ ـ چەھاردەھ | چهارده | چاردەھ |
| ١٥ ـ پانزدەھ ؟ | پانزده | پانزدەھ |
| ١٦ ـ شازدەھ | شانزده | شانزدەھ |
| ١٧ ـ ھەفتدەھ | هفده | ھەودەھ |
| ١٨ ـ ھەشتدەھ | هجده | ھەژدەھ |
| ١٩ ـ نەۋەزدەھ(٢٤) | نوزده(٢٥) | نۆزدەھ ، نۆزد(٢٦) |

تێبینی :

١ ـ لە زمانی ئاوێستادا ناوی ژمارەکانی (١١) تا (١٩) لە ڕێگەی یەکگرتنی ناوی ژمارەی یەکان + ناوی ژمارەی دەوە پێكدێ ، بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی فۆنەتیکی ڕووبدات .

٢ ـ ئەگەرچی زمانە ئێرانییەکانیش لەپێکهێنانی ناوی ئەو ژمارانەدا لەسەر هەمان دەستوور ڕۆیشتوون ، بەڵام هەندێ گۆڕانی فۆنەتیکی ڕوویداوە ... وێڕای ئەو گۆڕانە گشتییە ، دوو دەنگی (ز) و (ن) هاتوونەتە ناو بەشێك لە پێکهاتەکەوە :

(٢٤) بڕوانە : ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ١٩٦٦ . ل ٧٥ .

(٢٥) بڕوانە : ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٦٣ .

(٢٦) ف. ئا. نورۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٣٨ .

أ - دەنگی (ز) .

ئەم دەنگە تازە پەیدانەبووە ، بەڵگەش ئەوەیە نەك هەر لە زمانە ئێرانییە نوێکاندا هەیە ، بەڵکو لە فارسیی ناوەڕاستیشدا بەهەمان شێوە دەبینرێ و لە بەشێکی زۆری ناوی ژمارەکاندا بەشداری دەکا :

(یازدەه ، دوازدەه ، سێزدەه ، شازدەه ، نەهەزدەه) .

ب - دەنگی (ن)

وا پێدەچێ دەنگی (ن) زۆر درەنگ هاتبێتە نێو پێکهاتنی ناوی ئەو جۆرە ژمارانەوە ، چونکە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بە هیچ چەشنێك نابینرێ . لە زمانی فارسیی نوێ و زمانی بلووجیدا تەنیا لە وشەی (شانزدەه)دا هەیە (هەرچی «ن»ی وشەی «پانزدەه»ە ڕەسەنە و هی ئەسڵی وشەکەیە) ... لە زمانی کوردیشدا لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هەموو شێوەکاندا نییە و پتر تایبەتە بە ناوچەی سلێمانی ، پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم .

ژمارەی دەیان بەم جۆرە ناودەبرێن :

| کرمانجیی خواروو | | کرمانجیی ژووروو | |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٠ - دە | | دە(ه) | دەه |
| ٢٠ - بیست | | بیست | |
| ٣٠ - سی | | سی | سیه |
| ٤٠ - چل | | چل | |
| ٥٠ - پەنجا | | پێنجی | پێنجە |
| ٦٠ - شەست | شێست | شێست | |
| ٧٠ - حەفتا | حەوتا | حەفتە | هەفتێ |
| ٨٠ - هەشتا | | هەیشتە | هەشتێ |
| ٩٠ - نەوەد | | نۆد | نوت ، نۆت |

لە زمانی ئاوێستادا ناوی ژمارە دەیییەکانی لە (بیست)ەوە بەرەو سەرەوە (پەنجا) لە (ناوی ژمارەی یەکان) + (سەت) پێکدێت ... هەروەها (سەت)یشە لە ئێرانیدا (ات)ە[27] .

بۆ ژمارەی (بیست) فۆرمی جنسی نەتق – (ڤیشنەتنی)یش بەکاردێ[28] .

ناوی ژمارە دەیییەکانی لە (شەست)ەوە تا (نەوەد) لە (ناوی ژمارەی یەکان) + پاشگری (تی) شازدەبێ ، وەك :

خشڤەشتی (شەست).

هەپتاتی (حەفتا)

ئەشاتی (هەشتا)

نەڤەتی[29] (نەوەد)

لە هەندێ لە زمانە ئێرانییەکاندا ناوی ئەو ژمارانە بەم چەشنەیە :

---

(27) سەرچاوەی ناوبراو – س. ن. سۆکولۆڤا ، زمانی ئاوێستا ، ل ۷۰

(28) هەمان سەرچاوە ، ل ۷۱

(29) هەمان سەرچاوە ، ل ۷۱

| فارسیی ناوەڕاست | فارسیی نوێ | بلووچی |
| --- | --- | --- |
| ٢٠ – ڤیست | بیست | گیست |
| ٣٠ – سیە | سی | سی |
| ٤٠ – چیهل | چهل | چل |
| ٥٠ – پەنجاه | پنجاه | پەنجاه |
| ٦٠ – شەست | شصت | ئەشتاد |
| ٧٠ – هەفتات | هفتاد | هەفتاد |
| ٨٠ – هەشتات ، ئەشتات | هشتاد | هەشتاد[٣٢] |
| ٩٠ – نەهەمت[٣٠] | نود[٣١] | |

تێبینی

١ – وا دیارە وشەی «ڤیست»ی زمانی فارسیی ناوەڕاست و «بیست»ی کوردی و فارسی دەچنەوە سەر وشەی «ڤیسەتی» ، کە لە ئاوێستادا بۆ فۆرمی جنسی مێیە .

٢ – لەوە دەچێ وشەکانی «سی» و «چل»ی کوردی و زمانە ئێرانییەکانی دی شێوەی پەیدابوونیان لە ئاوێستاوە دوور بێ .

٣ – وشەکانی «هەفتاتی» ، «هەشتاتی»ی ئاوێستا کە بە یارمەتیی پاشگر (تی) سازبوون ، وا پێ دەچێ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا (ات)ی

(٣٠) سەرچاوەی ناوبراو ڤ. س. ڕاستورگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، ل ٧٥ .......

(٣١) سەرچاوەی ناوبراو ، ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، ل ٦٢ .

(٣٢) سەرچاوەی ناوبراو ڤ. ئا. فورۆلۆڤا ، زمانی بلووچی ، ل ٣٨ .

ئێرانی وەر ئەگرین : «هەفتات ، ئەشتات ـ هەشتات» . لـە زمانی فـارسیی نوێ و زمانی بلووجیدا (ت)ەکه بووە بـە (د) ـ «هـەفتاد ، هـەشـاد» . له زمانی کوردیـدا (ت) تێـداچووە و (ا) ماوەتەوە و وشەکان بـوون بـە «هـەفـتـا ، هـەشـتـا» .

٤ ـ وا دەردەکـەوێ «شـەست»یش لەسـەر هەمان دەسـتووری «حەفتا ، هەشتا» پێکهاتبێ و جیاوازی لـەوەدا بێ کـە لـەمدا (ا)کـەش سواوە . بەڵگەش ئەوەیە ، که له زمانی بلووجیـدا دەوترێ «شـەستاد» . جێی خۆیەتی ، ئەگەر بۆ پەیدابوونی وشـەی «شـەست» ، ئـەو رایـەش بخەینە پێش چاو ، که دوور نی یە له وشەی «شەش» (به کەمێ گۆڕانەوە)و «سەت»ی ئاوێستا سازبووبێ .

٥ ـ بۆ وشـەی «نـەوەد ـ نـەوەت» پتـر وا دێتـە پێش چاو ، کـە بەیارمەتی «ات»ی ئێـرانی سـازبـووبێ ، بـەڵام دووریش نی یـە (ی)ی پاشگری (تی) ئاوێستا سوابێ و (ت) مابێتەوە . هەرچی بوونی (ت)ە بـە (د) ، یان بـە پێچەوانـەوە بوونی (د) بـە (ت) دیـاردەیێکی فـۆنـەتیکی بێ دەمەتەقێ یە . ئەوەش ، که ئەم بۆچوونەی دووەم پتـەو بکا ، ئـەوەیـە له زمانی فارسیی کۆندا دەوترێ «نەڤەتی» و ئاشکرا دیاره ، که پاشگری (تی) چووەته سەر وشەی «نەڤه» ...[٣٣]

له زمانی کوردیدا ئـەو ژمـارانەی لـە نێـوان (بیـست) و (سـەد)ان (جگە له دەیی یەکان) بەو شێوەیەی خوارەوە سازدەبن :

ژمارەی دەیان + و + ژمارەی یەکان

٢١ ـ بیـست + و + یەك = بیـست و یەك

٢٢ ـ بیست + و + دوو = بیست و دوو

.......

---

(٣٣) له بەشە دیالێکتی کوردەکـانی ئازربایجانـدا ژمـاره دەیی یەکـان بـەم شێوەیەش ناودەبرێن : =

٢٠ - بيست + و + نۆ = بيست و نۆ
٣١ - سی + و + يەك = سی و يەك

٢٠ ـ دوی دەهـ
٣٠ ـ سێ دەهـ

٩٠ ـ نەهـ دەهـ
ياخـود
٤٠ ـ دوی بيست
٦٠ ـ سێ بيسـت

٨٠ ـ چـار بيسـت
يـان :
٥٠ ـ دوی بيست دەهـ
٧٠ ـ سێ بيست دەهـ
٩٠ ـ چار بيست دەهـ
. هتد

( بروانە ج. خ. باكايێف ، زمانی كوردەكانی سۆڤێت ، مۆسكـۆ ١٩٧٣ ، ل ١٢٩

مامۆستا قەناتی كوردۆش دەڵێ « لە زمانی كوردیدا لـە پـاڵ ژماردنی دەیی‌دا ، ژماردنی بیستی‌یش هەیە كە پێی دەوترێ (ژماردنی ژنانە) لەم جۆرە ژماردنەدا ، نەك دە ، بەڵكو دوو دەبی دەكرێتە بنەما بەوێنـە (دوو بيسـت ) لە بريتـی (چل) (سـێ بيسـت) لەجياتـی (شەست) ...» (دەستووری زمانی كوردی بە كەرەستەی دیالێكتـی كرمانجیی ژووروو و خواروو ، مۆسكۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٨٩ )

ئەم جۆرە بەكارهاتنە لە زمانی بلوچیشدا هەیە
٢٠ ـ گيست
٤٠ ـ دۆ گست
٦٠ ـ سەی گيست
٧٠ ـ سەی گيست و دەهـ
٩٠ ـ چار گيست و دەهـ
١٢٠ ـ هەپت گيست
هتد.

بروانە ڤ. ئا. فورولوڤا ، زمانی بلوچـی ، مۆسكـۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٣٨

٣٢ ـ سی + و + دوو = سی و دوو

.......

٣٩ ـ سی + و + نۆ = سی و نۆ

٤١ ـ چل + و + یەك = چل و یەك

.......

٤٩ ـ چل + و + نۆ = چل و نۆ

.......

٩١ ـ نەوەد + و + یەك = نەوەد و یەك

.......

٩٩ ـ نەوەد + و + نۆ = نەوەد و نۆ

ئەمە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو‌شدا بەهەمان چەشنە ، بەوێنە :

٢٤ ـ بیست + و + چار = بیستوچار

٢٩ ـ بیست + و + نە(ه) = بیستونە(ه)

ئەو جۆرە ژمارانە لە زمانی ئاوێستادا بەم شێوەیەی خوارەوە پێكدێ :

پەنجە ـ چە ڤیسەتی[٣٤] (بیست و پێنج)

لێرەدا دەبینین ، کوردی لە ئاوێستا جیادەبێتەوە ـ واتە هەرچی لە ئاوێستادایە لە پێشەوە «پەنجە» (پێنج) دێت و ئەوجا «ڤیسەتی» (بیست)

(٣٤) سەرچاوەی ناوبراو ، س. ن. سۆکۆلۆڤا ، زمانی ئاوێستا ، ل ٧١ .

بەلام لە کوردیدا بەپێچەوانەوەیە ـ واتە لە سەرەتادا «بیست» دیت و ئنجا «پێنج»[٣٥].

ئەم دیاردەیە لە زمانی هیندیی نوێ و زمانی عەرەبیدا وەك زمانی ئاوێستایە .. بە نموونە لە هیندی نوێدا دەوترێ :

چار (چوار) + بیس (بیست) = چوٚبیس

چێ° (شەش) + بیس (بیست) = چبیس[٣٦]

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا شێوەی پێکهاتنی ژمارەکانی نێوان (بیست) و (سەد) ، هەروەك زمانی کوردییە :

ژمارەی دەیان + وت + ژمارەی یەکان

٢٢ ـ ڤیست + وت + دوٚ = ڤیست وت دوٚ[٣٧]

ئەو (وت)ەی لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ژمارەکان پێکەوە دەبەستێ . [illegible] ئێرا [illegible] نوێکاندا لە شێوەی (و) دایە :

زمانی کوردی : بیست و دوو

زمانی فارسیی : بیست ودو

زمانی بلووجی : گیست و دوٚ

لە زمانی کوردیدا جیاوازیی وتنی ژمارەکانی (١١) تا (١٩) لەگەڵ ژمارەکانی (٢١) تا (٩٩) لەوەدایە ، کە کۆمەڵی یەکەم لە پێشدا یەکانیان دەوترێ و بە دوایاندا دەیان ، بەڵام کۆمەڵی دووەم بەپێچەوانەوە لە

---

(٣٥) شایانی باسە ، مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی ئەو جیاوازییەی زمانی ئاوێستا و زمانی کوردیی ئەمرۆی یادداشت کردووە (بڕوانە : سۆکۆلۆف زمانی ئاوێستا ـ وەرگێڕان و لێدوان و بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی کوردیی ئەمڕۆدا ـ محەمەد ئەمین هەورامانی ، بەغدا ، ١٩٨٨ ، ل ٢٠٤ ، پەراوێزی ژ ٢ ) .

(٣٦) سیامەند سەلیم ، چۆن فێری ئەم سێ زمانە دەبیت ( هیندی ، کوردی، عەرەبی) ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١١ ـ ١٢ .

(٣٧) سەرچاوەی ناوبراو ، ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، ل ٧٦ .

سەرەتادا دەیان دەوترێ و ئەوجا یەکان ، بەوێنە :

**چواردە ٤ و ١٠**

**بیست و چوار ٢٠ و ٤**

ژمارەی «سەد»ی کوردی لە زمانی ئاوێستاها «سەتەم»ە
ە زمانی هیندیی کۆندا «چەتەم»ە ؛ لە زمانی لاتینیدا «سەتنوم»ە
ە زمانی فەرەنسیدا «سەلت»ە ؛ لە زمانی ڕووسیدا «سۆ»یە
ە زمانی هیندیی نوێدا «سو»ە ؛ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا «سەتا»یە
ە زمانی فارسیی نوێدا «صەد»ە ؛ لە زمانی بلووچیدا «سەد»ە ...

**لە زمانی کوردیدا پێکهاتنی ژمارەی سەدان بەم چەشنەیە**

**ارەی یەکان + وشەی (سەد)**

| کرمانج خواروو | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|
| دوو + سەد ـــ دووسەد | دو + سەد ـــ دوسەد |
| سێ + سەد ـــ سێسەد | سێ + سەد ـــ سێسەد |
| نۆ + سەد ـــ نۆسەد | نە(ھ) + سەد ـــ نەسەد / نەھسەد |

لە زمانی ئاوێستادا ناوی ژمارەی سەدان یان بە شێوەی پێکەوەنانی سادە ـ (دوثەی سەتەی) یان بە شێوەی لێکدانی سادە ـ (خشڤەش سەتە) پێکدێ ، شێوەی پێکهاتنی ژمارەی سەدانی کوردی ... لێکدانی سادەی ئاوێستاییە ، هەرچی زمانی فارسیی ناوەڕاستو ... زمانی فارسیی نوێ و زمانی بلووچی ... یشە لەسەر هەمان ڕێگە ... ڕۆیشتوون :

فارسیی ئاوەڕاست : دەڤێ سەت

سێ سەت

فارسیی نوێ : سیصد

بلووجی : دۆسەد

دەربڕینی ژمارەکانی نێوان (١٠٠) و (١٠٠٠)یش بەم چەشنەیە .

سەدان + و + دەیان + و + یەکان

٢٤٥ دووسەد و چل و پێنج

٩٧٦ نۆسەد و حەفتا و شەش

بۆ وشەی «هەزار»ی کوردی لە زمانی ئاوێستادا وشەی «هەزەهرەم» دەبینین ؛ لە زمانی هیندیی کۆندا «سەهەسرەم» ؛ لە هیندی نوێدا «هزار» ؛ لە فارسیی ئاوەڕاستدا «هەزار» ؛ لە فارسیی نوێدا «هزار» ؛ لە بلووجیدا «هەزار ، هەدار» ...

پێکهاتی ژمارەی هەزارانیش بەم جۆرەیە :

ژمارەی یەکان ، دەیان ، سەدان + وشەی (هەزار)

دوو + هەزار ـــ دووهەزار

هەشت + هەزار ـــ هەشت هەزار

چوارسەد + هەزار ـــ چوارسەد هەزار

ئەمەش لە زۆر زمانی هیند و ئەورووپایی و زمانانی دی گرووپی جیاوازدا بەهەمان چەشنە . بەنموونە :

فارسیی ئاوەڕاست : دۆ هەزار

هیندی نوێ : چار هزار ... هتد .

لە زمانی کوردیدا ژمارەکانی نێوان (١٠٠٠) و (١٠٠٠٠٠٠)یش بەم جۆرە دەردەبڕرێن :

هەزاران + و + سەدان + و + دەیان + و + یەکان

١٨٩٤ هەزار و هەشتسەد و نەوەد و چوار

١٢٤٧٣ دوازدەهەزار و چوارسەد و حەفتا و سێ

٥٤٢٢٤٩ پێنجسەد و چل و دوو هەزار و دووسەد و چل و نۆ

٩٩٩٩٩٩ نۆسەد و نەوەد ونۆ هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ

.. هتد.

هەرچی وشەی «ملیۆن»یشە ، لە هەموو ئەو زمانانەدا کە من شتێکیان لێهەڵدەکرێنم ، هەر «ملیۆن»ە بە کەمێ جیاوازیی دەربڕینەوە .

* * *

لە ڕووی ڕۆنانیشەوە دەکرێ ناوی ژمارەکانی زمانی کوردی بەسەر سێ جۆردا دابەشبکرێن :

١ ـ سادە .

ژمارەی سادە ئەو ژمارەیەیە ، کە یەك بنەمای هەبێت . وەك :

یەك ـ دوو ـ سێ .... دە ـ بیست ـ سی ـ چل ـ سەد ـ هەزار ...

٢ ـ ناسادە .

ئەمیش دوو جۆرە :

أ) داڕێژراو .

داڕێژراویش ئەوەیە لەوشەیێکی سادە و پاشگرێك پێکهاتبێ ، وەك :
حەفتا ، هەشتا ...[38]

ب) لێکدراو .

لێکدراو لە دوو بنەما سازدەبێ ، وەك :
یازدە ، دوازدە ... چواردە ... نۆزدە .
دووسەد ، چوارسەد ... نۆسەد .[39]

٣ - پێکەوەبەستراو[40].

لە یەككەوتنی چەند ژمارەیەك پێكدێت ، کە بە یاریدەی (و)ی

---

(٣٨) هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ژمارەی دەیانی (بیست ، سی ، چل ، پەنجا ، شەست ، حەفتا ، هەشتا ، نەوەد )یان بە سادە داناوە (بڕوانە : د. زارێ یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٨٥ ، ل ٦٥) . وەك پێشتر لێی دواین ، بەلگەی مێژوویی وا ڕادەگەیەنێ « حەفتا ، هەشتا »و «پەنجا ، شەست ؟ » بە یاریدەی (ـا ت)ی ئێرانی سازبوون و لە کوردیدا (ت) تێداچووە و (ا) ماوەتەوە ... وشەی «نەوەد / نەوەت»یش یان بە هاریکاری پاشگری (ـتی) ئاوێستا یان (ـا ت)ی ئێرانی پێکهاتووە و هەندێ گۆڕانی بەسەردا هاتووە ... هەرچی (بیست ، سی ، چل)ە ڕواڵەتیان سادەیە . شایانی باسە ، مامۆستا صالح حسەین پشدەری وشەکانی ( پەنجا ، شەست ، حەفتا ، هەشتا ، نەوەد )ی بە داڕێژراو داناوە و (بیست ، سی ، چل)یش بە سادە (بڕوانە : کورتەیەك لە زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٣٨)

(٣٩) وەك پێشتر لێی دواوین ، ئەو (ا)یە چووەتە سەر وشەی «حەفت ، هەشت ...»و کردوونی بە «حەفتا ، هەشتا ...» کورت کراوەی (ات)ی ئێرانییە .

(٤٠) ژمارە لێکدراوەکانیش دوو جۆرن :

پێوەندی پێکەوە دەبەسترێن • وەك :

سەد و چوار ، سەد و بیست و حەوت •••••

ژمارەی سادە بنەما و کەرەستەی ڕۆنانی ژمارەی ناسادە و ژمارەی پێکەوەبەستراوە • ژمارەی ناسادەی (١١) تا (١٩) بە ڕێگای لێکدانی ژمارەی سادەی (١) تا (٩) لەگەڵ (١٠) هێنراوەتە ئەنجام • ژمارەی (دووسەد) تا (نۆسەد)یش لە (دوو سەدی ، دوو جار سەد •••)دوە سازکراوە ••• هەرچی ژمارەی پێکەوەبەستراویشە لە ئەنجامی یەکگرتنی ژمارەی سادە و ناسادەدا دروستدەبێ بەپێی پلە ، وەك (هەزار و سێ‌سەد و چل و شەش) •••

* * *

**٢ ــ ژمارەی پلەیی :**

ژمارەی پلەیی بەو وشانە دەوترێ ، کە لە ژماردندا ڕیزی شتی هاوڕەگەز رادەگەیەنن ، وەك (پرسیاری یەکەم ، کتێبی دووەم ، شەوی سێیەم • کوڕی چوارەم •••)

---

١ ــ بەشێکیان گۆڕانی فۆنەتیکی‌یان بەسەردا هاتووە . وەك :
یازدە ، پازدە ، شازدە ، حەڤدە •••

٢ ــ بەشەکەی دی‌یان هیچ گۆڕانێکی فۆنەتیکی‌یان بەسەردا نەهاتووە ، وەك :
دووسەد ، چوارسەد ، نۆسەد

له زمانی ئاوێستادا بۆ ژمارەی پلەیی «یەکەم» ، ئاوەڵناوی «فرد ـ تەرە» بەکاردێ ، کە واتای «پێشین ـ (یەکەمی دوان)» دەگەیەنێ .

«فرە ـ تەمە»ش واتای (یەکەمی فرە ، یەکەمی کۆمەڵێکی زۆر)دەدات . ئەمە بە زمانی هیندیی کۆن دەبێتە «پرە ثەمەس»[41] .

لە زمانی ئاوێستادا دە ژمارەی سەرەتای پلەیی بە یارمەتی پاشگری جیاواز سازدەبن . بەوێنە :

دڤیتیە ـ دووەم

تریتیە ـ سێیەم

ك(توورية) ـ چوارەم

پنکثە ـ ـ پێنجەم

خشتڤە ـ شەشەم

هەپتەثە ـ حەوتەم

ئەشتەمە ـ هەشتەم

نەڤەمە ـ نۆیەم

دەسەمە ـ دەیەم

بۆ ناوی ژمارەی پلەیی (یازدەیەم) تاکو (نۆزدەیەم) ، ناوی ژمارە بنجییەکە بەکاردێنرێ و وەك جۆرێ قەدی (ا)دار گەردان دەکرێ . وەك :

یازدە ـ یەنچەدەسە

یازدەیەم ـ یەنچەدەسە[42]

لە زمانی هیندیی کۆندا ژمارە پلەیییەکان ئەم شێوانەیان هەیە :

دڤیتیە ـ دووەم

تریتیە ـ سێیەم

---

(41) سەرچاوەی ناوبراو ، س. ن. سۆکۆلۆڤا ، زمانی ئاوێشتا ، ل 71 .

(42) هەمان سەرچاوە ، ل 72

نـوريـه ـ چـوارەم
پەنچەمە ـ پێنجەم
شەشتە ـ شـەشـەم
سەپتەتە ـ حەوتەم
ئەشتەمە ـ هەشتەم
نەڤەمـە ـ نۆيـەم
دەچەمە ـ دەيەم[٤٣]

ئەگەرچی لە زمانی ئاوێستا و زمانی هیندیی کۆندا هەندێ ژمـارەی پلەیی بە جۆری جیاواز سازدەبن ، بەڵام لە نموونەکـاندا ئـەوەش بـەدی دەکەین ، کـە بەشێکی زۆریان بـە یـارمـەتیی نیشـانـەی (ـ ەمـە)ەوە پێکهاتوون ... هەرچی ئەو نیشانەیـەی (ـ ەمە)یشە تـا دێ پتـر پـەرە دەستێنێ و زیاتر بەکاردێنرێ . بەوێنە ئەگەر لـە زمانی ئاوێستـاو زمـانی هیندیی کۆندا لە پێکهاتنی ژمارەی (هەشتەم ، نـۆیـەم ، دەیـەم ... )دا بەشداریی کردبێ ، ئەوەتە لە زمانی فارسیی کۆندا بە ئاشکرایی چووەتـە سەر ژمارەی (حەوت)یش...«حەوتەم» لەزمانی ئاوێستادا «هەپتەڤە»یە و لە زمانی هیندیی کۆندا «سەپتەتە»ش ، بەڵام لە زمانی فـارسیی کـۆنـدا «هەپتەمە»یە .

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ژمارەی پلەیی بە یاربدەی نیشـانـەی (ـ وم) سازدەبێ ، وەك :
چەهاروم ـ چوارەم
پـەنجوم ـ پێنجەم
شەشوم ـ شەشەم

(٤٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٧٢

له‌ به‌ش ئه‌مه‌ندا بۆ ژماره‌ی (یه‌كه‌م) و (دووه‌م) و (سێیه‌م) ، ئه‌م وشانه‌ش ده‌وترێن :

فره‌توم – یه‌كه‌م

دیت ، دیتیكه‌ر – دووه‌م

سیتیكه‌ر – سێیه‌م(٤٤) .

له‌ زمانی پشتۆدا ژماره‌ی پله‌یی به‌ یاریده‌ی نیشانه‌ی (– م) بۆ نێر و (– مه‌) بۆ مێ پێكدێ . به‌وێنه‌ :

پێنجه‌م – پێنجه‌مێكی نێر

پێنجه‌مه‌ – پێنجه‌مێكی مێ(٤٥)

له‌ زمانی بلووجیدا بۆسازكردنی ژماره‌ی پله‌یی، نیشانه‌ی (– ومی ، – مى) ده‌خرێته‌سه‌ر ژماره‌ی بنجی . به‌وێنه‌ :

چارومی – چواره‌م

هه‌ژده‌می – هه‌ژده‌یه‌م

گیستوومی – بیسته‌م(٤٦)

وێڕای ئه‌وه‌ له‌ هه‌ندێ حاڵه‌تی سازكردنی ژماره‌ی پله‌یی‌دا ڕێگه‌ی له‌ ده‌ستوور لادانیش ده‌بینرێ . وه‌ك :

پێشی – یه‌كه‌م

دوهمی ، گودی – دووه‌م

سه‌می ، سۆهی – سێیه‌م

ده‌همی – ده‌یه‌م(٤٧)

---

(٤٤) سه‌رچاوه‌ی ناوبراو ، ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوه‌ڕاست ، ل ٧٧ .

(٤٥) ن. ئا. دڤۆریانكۆڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسكۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤٤ .

(٤٦) سه‌رچاوه‌ی ناوبراو ، ف. ئا فورۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، ل ٣٩ .

(٤٧) هه‌مان سه‌رچاوه‌ ، ل ٣٩ .

لە زمانی کوردیدا ژمارەی پلەیی بەم ڕێگایانەی خوارەوەدا پەیدادەبێ :

یەك ـ بە یاریدەی نیشانەی (ـ ەم) ، کە دەخرێتە سەر ژمارەی بنجی ، وەك :

یەك + ەم = یەکەم

دوو + ەم = دووەم

. . . . . .

دە + ەم = دەیەم

**تێبینی :**

١ ـ نیشانەی ( ـەم)ی زمانی کوردی هەر (ـ ەمە)ی ئاویستایەو (ە)ی کۆتایی سواوە .

٢ ـ شێوەی (ـ ەم) لەنێو زمانە ئێرانییە نوێکاندا لە زمانی پشتۆدا دەبینرێ ، کە ئەویش بۆ حاڵەتی نێرە .

٣ ـ ئەم نیشانەیە لە زوربەی زۆری دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بەکاردێ .

٤ ـ کاتێ (ـ ەم) دەچێتە سەر ژمارەی بنجی ، بەو شێوەیەی خوارەوە خۆی دەنوێنێ :

أ) ئەگەر ژمارە بنجییەکە کۆتایی بە دەنگی نەبزوێن بێت ، ئەوە (ـ ەم)ی بە ڕەوانی پێوە دەلکێنرێ ، بێ ئەوەی هیچ زیادی و کەمییەك بێتە گۆڕێ . وەك :

یەك + ەم = یەکەم

چوار + ەم = چوارەم

پێنج + ەم = پێنجەم

ب) ئەگەر ژمارە بنجی‌یەکە کۆتایی بە بزوێنی (ا ، ێ ، ۆ ، ە ، ی)بێت ئەوە لە نێوان ژمارە و نیشانەکەدا (ی - y)ی نیمچەبزوێن پەیدادەبێ ، وەك :

سێ + ی + ەم = سێیەم

نۆ + ی + ەم = نۆیەم[48]

دە + ی + ەم = دەیەم

سی + ی +ەم = سی‌یەکەم

پەنجا + ی + ەم = پەنجایەم

ج) کاتێ ژمارەی بنجی کۆتایی بە بزوێنی (وو)دێت ، ئەوە لە نێوان ژمارە و نیشانەکەدا نیمچەبزوێنی (و - w )دێتە کایەوە ؛ هەروەها بزوێنی (وو)ی کۆتایی وشەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت .

دوو + (و w ) + ەم = دووەم

dû+w+em=dûwem

---

(48) کەریمی ئەیووبی و سمیرنۆڤا دەڵێن : لە ژمارەی (نۆ) ژمارەی پلەیی بە یاریدەی پاشگر (راستتر نیشانە - ئەورەحمان )ی (-یەم) سازدەبێ» ( دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل٥٤) .

بەر لە هەرشت ئەوە روون‌دەکەینەوە ، کە وشەی (نۆ) کۆتایی بە بزوێن هاتووە و نیشانەی (-یەم)یش بە بزوێن دەست‌پێ‌دەکات ... جا دەزانین کە دوو بزوێن پێکەوە نایەن و ئەیووبی و سمیرنۆڤا خۆشیان لە زۆر شوێنی کتێبەکەیاندا ئەو راستی‌یەیان وتووە ... وێڕای ئەوە ، ئاشکرا دیارە وشەی (نۆ) کە بزوێنی (ۆ) کۆتایی‌یەتی، وەك ئەو وشانەی بە بزوێنی (ا ، ێ ، ی ، ە) کۆتاییان دێ ، مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ و دەوترێ (نۆیەم) ...

دوو ـ بە هاریکاری نیشانەی (ـ ەمین) ، کە ئیزافەی سەر ژمارەی بنجی دەکرێت ، وەك :

یەك + ەمین = یەکەمین

دوو + ەمین = دووەمین

••••••

دە + ەمین = دەیەمین

تێبینی :

١ ـ بە شێوە دیارە ، کە نیشانەی (ـ ەمین) لە یەکگرتنی نیشانەی (ـ ەم) و (ـ ین) پێکهاتووە •

٢ ـ نەمانتوانیوە سەردەمی پەیدابوونی نیشانەی (ـ ەمین) دیاریبکەین ، بەلاّم ئەوەی دەیزانین ، ئەوەیە کە ئەو نیشانەیە لە ئاوێستا و لە فارسیی کۆندا و لە فارسیی ناوەڕاستدا نییە ••• هەروەها لە بەشێکی زۆری زمانە ئێرانییە نوێکانیشدا نییە ، بەلاّم لە زمانی فارسیی نوێدا (اُمین) هەیە وەك : سومین ، چهارمین ••••[٤٩]

٣ ـ نیشانەی (ـ ەمین)یش ، وەك نیشانەی (ـ ەم) لە زوربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا هەیە •

٤ ـ نیشانەی (ـ ەم) کە دەچێتە سەر ژمارەیێکی بنجی کۆتایی هاتوو بە بزێن یان نەبزوێن چۆن بەدەردەکەوێ ، ژمارەی (ـ ەمین)یش بەهەمان شێوە خۆی دەنوێنێ •

(٤٩) سەرچاوەی ناوبراو ، ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٦٨ .

گەلێ جار ئەوە بەدی دەکرێ ، کە لـە نێوان ژمـارە بنجی‌یـەکـە و نیشانەی (ـ ەم) و (ـ ەمین)دا نەبزوێنی (ه) بەکاردێنرێ ، وەك :

سێ + ه + ەم/ەمین = سێهـەم/سێهـەمین

دە + ه + ەم/ەمین = دەهەم/دەهەمین

ئەگەر بۆ دەست نیشانکردن و ڕوونکردنەوەی دەمی پـەیدابوونی ئەو (ه)ە ، گەشتێك بە دیوانی شاعیرانی زووی کـورددا بکـەین ، ئـەوە ئەو (ه)ە بە هیچ جۆرێك نابینین ... تەنانەت لـە ئـەدەبیـاتی کـوردی سەرەتای ئەم سەدەیەشدا بەرچاو ناکەوێ . بۆ نموونـە لـە ڕۆژنـامـەی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا سەرنجڕاگرتن لە ژمارەکان ، ئەو ڕاستی‌یـەمـان پێدەسەلمێنێ کە ئەو (ه)یەی ئەمڕۆ هەندێ لە نووسەران دەیخەنـە نێوان ژمارە و نیشانەی (ـەم ، ـ ەمین)ی پلەیانەوە ، شتێکە لە لاوە هێنراوەتـە ناوانەوە ، لەگشت شوێنێك و تێکڕای وتارەکانی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا ، ناکە ژمارەیەك چی‌یە (ه)ی لەگەڵ نەنووسراوە ، بەوێنـە بـڕوانە : (ژ۲۱ ، ل۱ ، س۲ ، د٦ – «دومیـن») ؛ (ژ۲۱ ، ل۱ ، س۲ ، د١٥ «سـیمین») ؛ (ژ۲۱ ، ل۱ ، س۲ ، د۲۰ – «چـوارمین») ؛ (ژ۲۸ ، ل۳ ، س۳ ، د۲۰ «دومین») ؛ (ژ۲۸ ، ل۳ ، س۳ ، د۲۸ – «دوم») .

هەروەها نەبینی ئەو (ه)ە لە چاپەمەنی‌یە کـوردی‌یـەکـانی دی ئـەو سەردەمەدا ، ڕای دانانی بـە شتێکی لـە لاوە هێنـراو پتـەو دەکـات . بۆ نمـوونـە بـڕوانە : «ڕۆژی کـوردستـان» (ژا ، ل۲ ، س۱ ، د۲۷ – «بیستەمین») .

دەبینین کاتێ نیشانەی (ـ ەم) ، (ـ ەمین) دەچنە سەر هەندێ ژمارە دەربڕینیان کەمێ گرانە ... جـا وا پێدەچێ لە سەرەتـادا ئـەو (ه)ە بـۆ

...سان‌کردنی پێکەوەبەستنی ژمارە و نیشانەکە و وتنی ئـەو جۆرە ژمارانە ...بێـە ناوانەوە و دواتر پـەرەی سەندبێ...(٥٠) پێویستـە پـەنجە بـۆ ...ەوەش ڕابکێشین . کە لە نێو زمانە ئێرانییە نوێکاندا لە زمانی بلووجیدا ...و (م)ە دەچێتە سـەر چـەند ژمـارەیـەك ، وەك : سـۆهمی (سێیـەم) ...ەهمی (دەیەم) ...(٥١)

...ە زمانی کوردیدا ئـەگەر ژمارەکـە پێکەوەبەستراو بـوو . ئـەوە ...یشانەی (ـ ەم) و (ـ ەمین) دەچنە سەر دوا ژمارە ـ واتە تەنیا دوا ژمارە ...یشانەی پلە وەردەگرێ . بۆ نموونە :

سـەد و چل و یـەك

سەد و چل و یەکەم / سەد و چل و یەکەمین

بەپێی دەستووری زمانی کوردی ئەگەرچی ژمارەی پلـەیی بـەدوا

---

(٥٠) کەریمی ئەیووبی و ئی . ئا . سمیرنۆڤا دەڵێن : «ئەو ژمارانەی کۆتاییان بە دەنگی بزوێن دێت (جگە لە نۆ) ، کاتێ نیشانەی (ـەم ، ـ ەمین)یان دەخرێتە سـەر ، لە نێوان کۆتایی ژمارەکان و سەرەتای وشەکانـدا نەبزوێنی (هـ) یان (ی ـ Y) پەیدا دەبێ» (دیالێکتی کوردی موکری . لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٥٤) . لەم بارەوە دەڵێین :

١ ـ نەبزوێنی (هـ) لە زوودا نەبووە و تازە هاتۆتـە ناوانـەوە و لە لاوە هێنراوە . ئەمڕۆش کە بەکاردێنرێ ، تەنیا بۆ ئەو ژمارانە نییـە کە کۆتاییان بە دەنگی بزوێن دێ ، بەڵکو بۆ تێکرای ژمارەکانە ـ واتـە بۆ ئەو ژمارانەشە کە بە نەبزوێن کۆتاییان دێت . بەوێنە چۆن دەوترێ (سێهەم) ، بە هەمان شێوە دەشوترێ (چوارهەم) ...

٢ ـ هەرچی نیمچەبزوێنی (ی ـ Y )یشە ڕاست نییە بوترێ دەچێتە سـەر هەموو ئەو ژمارانەی کۆتاییان بە بزوێن دێ ، چونکـە ئەوەتە ژمارەی (دوو) کۆتایی بەبزوێن دێ و ناشێ (ی ـ Y )ی بخرێتە سەر ـ واتە ناوترێ (دوویەم) ...

(٥١) سەرچاوەی ناوبراو ، ڤ . ئا . فوزرۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، ل ٣٩ .

ناودا دێت[٥٢] و وەك ئاوەڵناو دەبێتە دیارخەری ناو . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ پێش ناوەکە بخرێ . بەوێنە :

نامەی دووەم (دووەمین) / دووەم (دووەمین) نامە

ساڵی چوارەم (چوارەمین) / چوارەم (چوارەمین) ساڵ[٥٣]

ژمارەی پلەیی ئەگەر بەدوا ناودا هات بە یاریدەی (ـ ی) ئیزافە پێکەوە دەبەسترێن ، بەڵام کە بکەوێتە پێش ناوەکەوە ، هیچ نیشانەیەك پەیدا نابێ ــ واتە بێ یاریدەی نیشانەی ئیزافە بەدوا یەکتردا دێن .

لەبەر ئەوەی ژمارەی پلەیی لەگەڵ ئاوەڵناودا هەندێ خاسیەتی وێکچوویان هەیە ، بەشێك لە زانایان بە جۆرێك لە ئاوەڵناوی دەژمێرن . دانانی ئەو جۆرە وشانە لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناودا شتێکی چاولێکەرییە .

تێزیکی ژمارەی پلەیی لەگەڵ ژمارەی بنچیدا بووەتە هۆی ئەوەی ، هەندێ جار ژمارەی بنچی بە واتای ژمارەی پلەیی بەکاربهێنرێ . بۆ نموونە (پۆلی چوار) لە بریتی (پۆلی چوارەم) ...

سێ ـ نیشانەی (ـ وم)

لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کرمانجیی ژووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی ئەمڕۆی زمانی کوردیدا ، دەبینین بە یاریدەی نیشانەی (ـ وم) . لە دەخرێتە سەر ژمارەی بنچی ، ژمارەی پلەیی پێکدێ . وەك :

یەکوم ، دووم .... چاروم ...

---

(٥٢) لە زمانی ڕووسیدا بە پێچەوانەی کوردییەوەیە ــ واتە ژمارەی پلەیی هەمیشە لە پێش ناوەوە دێت .

(٥٣) ئەم پاش و پێشکەوتنە لە زمانی فارسیشدا باوە و لەم بارەیەوە ذو النور دەڵێ : « اصولا تقدیم و تاخیر عددهای ترتیبی (صفت‌های شمارشی ترتیبی) در مقابل معدود جایز است چنانکه : سومین روز ، پنجمین سال ... روز سوم ، سال پنجم ...» (در صرف و نحو و املای فارسی ، ل ٦٨) .

نیشانەی (ـ وم) لە زمانی فارسیی ناوەڕاست و زمانی فارسیی نوێدا نیشانەی سەرەکی پێکهێنانی ژمارەی پلەیییە .

وێڕای ئەو نیشانانە ، لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و بەشە دیالێکتەکانیدا بۆ سازکردنی ژمارەی پلەیی کەرەستەی دیکەش بەکاردێنرێ :

١ ـ نیشانەی (ـ انی) ، کە دەخرێتە سەر ژمارەی بنجی ، وەك :

بەکانی

دوانی

.......

چارانی[54]

٢ ـ نیشانەی (ـ ێ) ، کە ئیزافەی سەر ژمارەی بنجی دەکرێ . لە پێکهاتنی ئەم فۆرمەدا هەمیشە جێناوی (یا) بۆ تاکی مێ و (یێ) بۆ تاکی نێر و (یێد/یێت) بۆ کۆ بەکاردێنرێ . وەك :

یا یێکێ

یێ یێکێ

یا سێیێ

یێ سێیێ

---

(٥٤) بڕوانە :

أ ـ ق. کوردۆ (کوردۆییێف) ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٤٠ ـ ١٤١ .

ب ـ ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣٦ .

يێد / يێت سێيێ[55]

٣ ـ ژمارەی پلەیی لە ژمارەی بنجیی (دوو)ەوە و بەرەو ژوور بە یاریدەی نیشانەی کۆی دۆخی تیان (ـان) یاخود (ـ ا) سازدەکرێ . ئەم بارەدا بەپێی ئەرك ، لە پێشی ژمارەکەوە جێناوی (یا) یاخود (ا) : (یێ) یاخود (ێ) بۆ تاك دادەنرێ و بۆ کۆش (یێد/ێد) یاخود (یێن/ێن) . جێناوەکە جنسی ژمارە پلەیی‌یەکە دیاریدەکا . وەك :

| | |
|---|---|
| یا چاران<br>یا دەهان | بۆ تاکی مێ |
| یێ چاران<br>یێ دەهان | بۆ تاکی نێر |
| یێد چاران<br>یێن بیستان | کۆ ـ نێر و مێ[56] |

٤ ـ ژمارەی بنجی کە دەوری ناوی دیارخەر دەبینێت و نیشانەی (ـ ان) یان (ـا)ی کۆی دەچێتە سەر، وەك ژمارەی پلەیی خۆی دەنوێنێ .

---

(55) بڕوانە : د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی «وڵاتان و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك و ناوەڕاست» ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٤٥ .

ق. کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨، ل ٩٠ .

(56) هەمان سەرچاوە ، ل ٩٠ .

بـۆ نـمـوونـه :

سالا بیستا (ن)

رۆژا دهها (ن)[٥٧]

٥ ـ له بەشە دیالێکتی کوردەکانی تورکمەنستاندا نیشانەی (ـ ۆم) و (ـ ۆمی)یش دەچنە سەر ژمارەی بنچی و دەیانکەنە ژمارەی پلەیی[٥٨] .

(ـ ۆم) له (ـ وم)ی زمـانی فارسیی تـاوەڕاست و زمـانی فـارسیی نوێوه نزیکه . هەرچی (ـ ۆمی)یشه له (ـ ومی) زمانی بلووجی دەچێت .

له زمانی کوردیدا وێڕای ڕێگەی وشەسازی ـ واته ئەو ڕێگەیـەی که نیشانه سەرەکییەکان و ئـەوانی دی دەچنـه سـەر ژمـارەی بنچی و دەیانکەنه ژمارەی پلەیی ـ هەروەها ڕێگەی ڕستەسـازی و وەرگرتنیش هەیـه . بـەوێنـه :

کاتێ ژمارەی بنچی وەك دیارخراو خـۆی دەنـوێنێ و نیشـانـەی (ـ ی)ی ئیزافه وەردەگرێ ، وەك ژمـارەی پلـەیی لێدێ . ئـەم شێـوە پێکهاتنه به زۆری لەگەڵ ناوی مانگەکاندا دێت ، وەك :

یـەکی ئـایـار

شەشی ئەیلوول

چواردەی گەلاوێژ

---

(٥٧) هەمان سەرچاوە ، ل ٩٠ .

(٥٨) مامۆستا چەرکەزی بـەکۆ (ـوۆم) و (ـوۆمـی)و (ـیۆم)یشی لەگـەڵ (ـۆم)و (ـۆمی) داناوه (بڕوانه : زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ . ل١٣٤ـ١٣٥) ، بەلاّم ئاشکـرا دیـاره کـه (و)ی سەرەتـای (ـوۆم)و (ـوۆمی) نیمچەبزوێنه و پێویست هیناویەتیيه ناوانـەوه و لەگەڵ ئەسڵی نیشانەکاندا نییه ـ واته نیشانەکان (ـۆم)و (ـۆمی)ن ، نەك (ـوۆم)و (ـوۆمی) . . . هەرچی (ـیۆم)یشه دیسان هەر (ـۆم)ه و (ی)یەکەی سەرەتای نیمچەبزوێنه و له نێوان دوو بزوێندا پەیدابووه .

نۆزدەی حوزەیران

بیستی مانگ

ئەم حالەتە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە هەمان شێوە دەبینرێ • ئەوەندە هەیە (ـ ی)ی ئیزافە لەوێدا دەبێ بە (ـ ێ) • وەك :

یەکێ گولانێ[59]

نموونەی وەرگرتنیش ئەوەیە کە ژمارەی (یەك) جگە لە فۆرمی (یەکەم) و (یەکەمین) ••• هەروەها فۆرمی (ئەوەل ، حەوەل) و (هەوەلین) یشی هەیە ، کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە[60]

* * *

## ٣ ـ ژمارەی کەرتی :

ژمارەی کەرتی ئەندازەی کەرت ڕادەگەیەنێ ـ واتە چەندێتی ئەم یان ئەو بەشی دالەکە نیشان دەدا و دەردەخا ، وەك (سێیەك ، چواریەك •••)[61] • لە پێکهاتنی ژمارەی کەرتیدا ناوی پارچەکانی لە واتای پلە بێبەرن •

---

(٥٩) شایانی باسە ، مامۆستا قەناتی کوردۆ لەم کێشەیە دواوە (بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ـ بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو ـ ل ٨٩ ) .

(٦٠) هەندێ لە نووسەران ئەوەیان یادداشتکردووە ، بڕوانە :
أ ـ قەناتی کوردۆ ، هەمان سەرچاوە ، ل ٨٩
ب ـ کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٦٥ .

(٦١) لە زمانی ڕووسیدا پێکهاتنی ئەم جۆرە ژمارانە بەپێچەوانەوەیە ـ واتە (یەك) لەپێش (سێ)و (چوار)ەکەوە دێت .
لە زمانی هیندیی نوێدا هەروەك کوردییە ، واتە (یەك) لە دوای (سێ) و (چوار)ەکەوە دێت . بەوێنە بڕوانە (تینوا حصە ، چوتها حصە ...) (بڕوانە : سیامەند سەلیم ، چۆن فێری ئەم سێ زمانە دەبیت ـ هیندی ، کوردی ، عەرەبی ـ بەشی ،یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٩ .

لەزمانی کوردیدا ژمارەی کەرتی (سێیەك ، چواریەك ...) ، کە جۆری هەرە دیار و باون ، وشەی لێکدراون و لە دوو ژمارەی بنجی پێکهاتوون : (سێ + یەك ؛ چوار + یەك ...) • لە دیالێکتی ژووروو شدا به هەمان شێوە دەوترێ : (سێیەك ، چاریەك ...)[62] • وێنەی ئەم پێکهاتنە لە زمانە ئێرانییەکانی دیشدا بە هەمان جۆر بەرچاو دەکەوێ • بەوێنە لە زمانی فارسیی نوێدا دەوترێ : «چهاریك . صدیك ...»[63] و بە زمانی بلووجیش «سەیەك ..»[64] ..هتد •

ئەم جۆرە پێکهاتنەش تەنها لەو ژمارانەدا وەتگتدەدەکەوێ ، کە ژمارەی دووەمیان (یەك)بێت ... بەلام ئەگەر ژمارەی دووەم ژمارەی (یەك) نەبێت : ئەوە ژمارە کەرتییەکە وەك وشەیێکی لێکدراو پەیدا نابێ[65] ، بەلکو لە شێوەی دەستەواژەیەکدا دەردەکەوێ ، کە دەشێ دەربڕینی وەسفی پێبوترێ • بۆ سازبوونی ئەمەش لە زمانی کوردیدا چەند جانەتێك بەرچاو دەکەوێ :

۱ ــ بە یارمەتیی پێشبەندی (لە) • ئەمیش بە دوو چەشن دەبینرێ :

أ) پێشبەندی (لە) لە سەرەتای دەستەواژەکەوە دێت ، بە واتایێکی دی لە پێش ژمارەی یەکەمەوە دەبێ • ژمارە گەورەکە لە پێشدا دێت و بە دوایدا

---

(٦٢) جگرخوین . ناوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ۱۹٦۱ ، ل ۳٤

(٦۳) ذو النور . دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی تهران ، ۱۳٤۳ ، ل ٦۹ .

(٦٤) ف . ئا. فورۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۰ ، ل ۳۹ .

(٦٥) شایانی باسە . مامۆستا تۆفیق وەهبی پەنجەی بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشاوە (بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ۱۹۲۹ ، ل ۷٦ .

ژماره بچووکەکە ـ واتە ژمارە گەورەکە دەبێتە یەکەم و بچووکەکەش
دووەم . وەك :

لـە دە پێنـج
لـە سـەد دە

لـە هـەزار دوو
.....هـتـد .

زۆر جار لەم پێکهاتنەدا دوو دیاردە سەرهەڵدەدەن :

یـەك :

ژمارەی یەکەم نیشانەی (ان)ی کۆ وەردەگرێ . وەك :

لـە دەیـان پێنـج
لـــە ســـەدان دە
لـە هـەزاران دوو

دوو ـ

بۆ تەواوکردنی پێشبەندی (لە) پاشبەندی (دا) دەچێتە سەر کۆتایی ژمارەی یەکەم و لەشێوەی کورتکراوەدا، واتە وەك (ا) بەدەردەکەوێ.وەك:

لە دەدا (دەیا) پێنج
لە سەددا (سەدا) چل
لە هەزاردا (هەزارا) دوو

ئەم دوو دارشتنە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بەهەمان شێوە دەبینرێ ، تەنیا ئەوەندە هەیە (ژ) لەبریتی (لـە) بەکاردێنـرێ و ژمـارەی یەکەم هەمیشە نیشانەی کۆی (ان) یان (ا) وەردەگرێ . وەك :

ژ پێنجان سێ

ژ دەهان چار[٦٦]

لەم پێکهاتەدا گەلێ جار لە دیالێکتی خواروودا وشەی (بەش کەرت ...) و لە دیالێکتی ژووروودا وشەی (پار ، سەلەف ...) بەشداری دەکەن[٦٧] . وەك :

لە شەش بەش سێ بەش

لە دە کەرت چوار کەرت

ژ چار پارا سێ پار

ژ حەفتا سێ پار / ژ حەفت پارا سێ[٦٨]

ژ سەدان نەھ سەلەف

دەھ سەلەف ژ سەدا[٦٩]

... هتد .

---

(٦٦) مامۆستا قەناتی کوردۆ لە کتێبی (دەستووری زمانی کوردی ــ بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو ــ ل ٩٤)دا باسی ئەو تایبەتێتی‌یەی کردووە .

(٦٧) نموونەی ئەو جۆرە وشە بەشداری‌کەرانە لە زمانی پشتۆدا وشەی (بەرخە) (بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، موسکو، ١٩٦٠، ل ٤٤) و لە زمانی بلووجی‌دا وشەی (بەھر ، بەھەر)ن (بڕوانە : ڤ. ئا. فورۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤٠ )

(٦٨) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٣٦ .

(٦٩) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٤٣ .

ب) له سەرەتادا ژمارە بچووکەکە و له ناوەڕاستدا پێشبەندی (له)و
له کۆتاییدا ژمارە گەورەکە ، وەك :

**پێنج لە سەد**

**سەد لە هەزار**

هەندێ جار لەم پێکهاتنەدا ئەو دیاردەیەش سەرهەڵدەدا ، کە دوا ژمارە ، بەواتایێکی دی ژمارە گەورەکە نیشانەی (ـ ان)ی کۆ وەردەگرێ

**یەك لە چلان**

٢ ـ بە هاریکاریی وشەی (لەسەر) ، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ژمارەکەوە ، هەرچی ژمارەکانیشە ، بچووکەکەیان لە سەرەتاوە دێت و لە کۆتاییدا ژمارە گەورەکە ، وەك :

**دوو لەسەر پێنج**

**چوار لەسەر هەشت**

**پێنج لەسەر بیست**(٧٠)

**تێبینی :**

ئەم چەشنە دەربڕینەو دەربڕینی جۆری (ب)ی خاڵی یەکەم پتر لە بەرکاریدا باوە ، بەوێنە :

---

(٧٠) لە بەشە دیالێکی ئەترووش و بامەڕنی‌دا ئەم جۆرە دەربڕینە ڕێگەی سەرەکیی پەیدابوونی ژمارەی کەرتی‌یە ، وەك :

سێ لسەر چارا

چار لسەر حەفتا

( بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، ل ٣٣٥) .

که دموترێ (پێنج له سەد) مەبەست (٥٪)ە .

که دەوترێ (سەد له هەزار) مەبەست (١٠٠٪)ە

. . . . . .

که دموترێ (دوو لەسەر پێنج) مەبەست (٥/٢)ە .

که دموترێ (چوار لەسەر هەشت) مەبەست (٨/٤)ە

. . . . . .

٣ ـ به یاریدەی نیشانەی ئیزافەی (ی) ، که به ژمارەی یەکەمەوە دەلکێ[٧١] . لەم بارەدا له سەرەتادا وشه گەورەکه دێ و ئەوجا به دوایدا وشه بچووکەکه . وەك :

سەدی هەشت

سەدی چوار

٤ ـ له هەندێ بەشه دیالێکتی موکری[٧٢] و بەشه دیالێکتی کوردەکانی تورکمەنستان[٧٣] و هەندێ ناوچەی دیدا ژماره گەورەکه بەدوا ژمارەبچووکەکەدا دێ و نیشانەی (ـ م)ی پلەش وەردەگرێ . وەك :

له بەشه دیالێکتی موکری‌دا :

پێنج هەشتەم ـ واته (پێنج له هەشت)

سێ سەدەم ـ واته (سێ له سەد)

له بەشه دیالێکتی کوردەکانی تورکمەنستاندا :

---

(٧١) د. زاری یوسف ئەو دەستوورەی باس‌کردووه (بڕوانه : سەرچاوەی ناوبراو ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، ل ٦٧) .

(٧٢) بڕوانه : سەرچاوەی ناوبراو ، کەریمی ئەیووبی و ئی ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، ل ٥٥ .

(٧٣) بڕوانه : سەرچاوەی ناوبراو ، چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٣٦ .

سێ چارۆمی ـ واتە (سێ لە چوار)

چار پێنجۆمی[٧٤] ـ واتە (چوار لە پێنج)

٥ ـ لە بەشی زۆری دیالێکتی ژووروودا (ـ انی) دەچێتە سەر ژمارە گەورەکە و ژمارە گەورەکەش بە دوا ژمارە بچووکەکەدا دێت و ژمارەی کەرتی سازدەبێ ، وەك :

پێنج بیستانی

یەك چارانی[٧٥]

و هەندێ رێگەی دی ...

وشەی (چارەك) و (نیو)یش ، کە ژمارەی کەرتین ، واتای چەندێتییان تێدایە . (چارەك) ـ (چواریەك)ی شتێکە و تەنانەت پێکهاتنەکەشی دیارە بریتییە لە (چوار ـ چار) + (یەك ـ ەك) ... (نیو)یش لە دوو بەش بەشێك رادەگەیەنێ . ئەم وشانە لە هەندێ شێوە کوردیدا

---

(٧٤) لە زمانی پشتودا هەمان شێوە پێکهاتن دەبینرێ ، بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، ل ٤٤ ) .

(٧٥) بڕوانە :

ا ـ سەرچاوەی ناوبراو ، قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو) ، ل ٩٤ .

ب ـ سەرچاوەی ناوبراو ، قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٤٣ .

ج ـ سەرچاوەی ناوبراو ، چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ، ل ١٣٦ .

(چارەگ) ؛ (نیم ، نیڤـ)ن . (نیـو)و (نیم)یش فۆرمی (نیـوە)[٧٦]و (نیمە)شیان هەیە[٧٧] .

* * *

**ژمارەی دابەش ؟**

لە هەردوو دیالێکتی سـەرەکیی کـوردیـدا ژمـارەی دابـەش بـە دووپاتکردنەوەی ژمارەی بنجی پێکدێ

| کرمانجیی خوارو | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|
| یەك یەك | یەك یەك |
| دوودوو | دودو ، دۆدۆ |

(٧٦) مامۆستا تۆفیق وەهبی وشەی «نیو»ی بە ژمارەی بنجی داناوە و وشەی «نیوە»یش بە ژمارەی کەرتی (دەستووری زمانی کـوردی ، ل ٧٧ ) . وەك ئاشکرایە « نیو »و « نیوە » هەردووکیان لە دوو بەش بەشێـك رادەگەیەنن . بۆ نموونە چـۆن دەشێ بوترێ «منداڵەکـە نیو سێـوی خوارد » ، بەهەمان چەشن دەلوێ بوترێ «منداڵەکە نیوەی سێوەکەی خوارد». یاخود «قوتابییەکە نیو دەفتەری پڕکردەوە » / «قوتابییەکە نیوەی دەفتەرەکەی پڕ کردەوە»...جا مەسەلە ئەوە نییە «نیو» ژمارەی بنجی بێت و «نیوە»یش کەرتی ، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە «نیو» شتـی ( مطلق ، تجرید ) رادەگەیەنی و «نیوە»یش «مجسمە ، محدود»ە ...

(٧٧) وشـەی (نیو ، نیم) لـە ئێریەن ڤاچدا «نەیمە»یە و لە هیندیی کۆنـدا (نێمە)و لەفارسیی ناوەڕاستدا(نێم، نێمەك)ە...(بڕوانە: محەمەد ئەمین هەورامانی، فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل١٨٣). لەزمانی پشتۆدا (نیم ، نیمە)یە (بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکوڤ ، زمانی پشتـۆ . ل ٤٤) ؛ لـە زمانی بلووجیدا (نێم)ە (بڕوانە : ڤ. ئا. فورۆلۆڤا، زمانی بلووجی ل ٤٠ ...

| | | |
|---|---|---|
| سێ‌سێ | — | سێ‌سێ |
| چوارچوار | | چوارچوار |

... هتد .

شێوەی (یەکەیەکە . دواندوان . سیانسیان)یش بەکاردێ . وێـڕای ئەوە ، ئەوەش دەبینرێ ، کە لە دووپاتکردنـەوەی ژمـارە بنچی‌یـەکـەدا پێشبەندی (بە) لە ناوەڕاستدا پەیدادەبێ . وەك :

یـەكبـەیـەك

دووبـەدوو

سێ‌بـەسێ

چـواربـەچـوار

... هـتـد .

هەرچی ئەو پێشبەندەشە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (بِ ـ bi)دایە ، وەك :

یـەكبـیـەك

دوبـدو

سێ‌بـسێ

چـاربـچـار

ئەو پێشبەندە لە هەندێ بەشە دیالێکتی هـەردوو دیـالێکتـدا لـە شێوەی (وە)دا دەبینرێ . وەك :

| | |
|---|---|
| یەكوەیەك | یەكوەیەك |
| دووەدوو | دووەدوو |
| سێوەسێ | سێوەسێ |
| چوارەچوار | چاروەچار |

... هتد .

تێکڕای ئەو نووسەرانەی باسی ئەم کێشەیەیان کردووە ، نەك هەر بە چەند دێڕێك کۆتاییان بە لێدوانەکەیان هێناوە و هەڵەی گەورەیان کردووە ، بەڵکو مەبەستیشیان نەپێکاوە :

١ ـ بەلێ (یەك‌یەك ، دوودوو ، سێ‌سێ ، چوارچوار ...) لە دووپات کردنەوەی ژمارەی بنجی پێك‌دێن ، بەڵام پێویستە بزانین ، دەشێ ئەو جۆرە وشانە لە بەشە ئاخاوتنی ژمارەدا دابنێین یان نا ...

(یەك ، دوو ، سێ ، چوار ...) ژمارەن و دەوترێ (یەك پیاو هات ، دوو کوڕ هاتن ...) . لێرەدا ئاشکرا دیارە ، کە (یەك ، دوو ..) ژمارەی (پیاو ، کوڕ...) نیشان دەدەن ـ واتە چەندێتی ناو دیاری‌دەکەن ، بەڵام کە دەوترێ (پیاوەکان یەیەك هاتن ، کوڕەکان دوودوو هاتن ...) ، ئەوە (یەك‌یەك ، دوودوو ...) بەدوا یەکتر هاتنی کردارەکە (هاتن) نیشان دەدەن . کەواتە کە وەسفی چۆنێتی (هاتن)ەکە بکەن و وەسفی (پیاو ، کوڕ ...) نەکەن ، ئەوە دەبنە ئاوەڵکردار . بەو پێیە (یەك‌یەك ، دوودوو...) ژمارە نین و (ئاوەڵکرداری تەرتیبی)ین .

٢ ـ چ لە ڕووی ڕاگەیاندنی واتاو چ لە بواری بەکارهێنانەوە جیاوازی لە نێوان ئەو دوو جۆرە پێکهاتنەدا هەیە . بەوێنە ئەگەر بڵێین :

(دوودوو دانیشتبووین) ، ئەوە ناشێ تەنیا دوو کەس بین ، بەڵکو دەبێ چەندین کەس بین و هەر دوانمان پێکەوە دانیشتبین . بەڵام کە دەڵێین (دووبەدوو دانیشتبووین) ، بەپێچەوانەوە دەبێ تەنیا دوو کەس بین پێکەوە دانیشتبین و ناکرێ مەبەستی کەسانی زۆر بگرێتە خۆ ..ئەمەو گەلێ جیاوازیی دی هەیە ، کە لێرەدا بە پێویستی نازانین بە درێژی لێی بدوێین .

جگە لە دووپات کردنەوەی بێپاریدە ، چەشنە دووپاتکردنەوەیێکی دیش هەیە ، کە بە پاریدەی ئاوبەند سازدەبێ ، وەك :

أ ـ بە پاریدەی ئاوبەندی (او) . وەك :

یەکاویەك ...

ب ـ بە پاریدەی ئاوبەندی (بە) . وەك :

هەزاربەهەزار ....هتد ...

ئەو جۆرە وشانەس ـ (یەکاویەك ... هەزاربەهەزار ...) ، کە بە پاریدەی ئاوبەند سازدەبن ، دەبنە ئاوەڵناو .

لە ڕاستیدا ژمارەی بنجی چ بە دووپاتبوونەوە ، چ بە وەرگرتنی پاشگر ، چ بە یەکگرتنی لەگەڵ وشەی بەشە ئاخاوتنی دیدا .. توانایەکی باشی هەیە لە ڕۆنانی وشەی نوێدا .

پێشتر لە دووپاتبوونەوەی ژمارەی بنجی دواین ، ئێستاش با لەگەڵ مۆرفێمەکانی دیدا تەماشای بکەین :

★ لەگەڵ پاشگردا :

حەوتە ، چلە ، سەدە ...

دوانە ، سیانە ...

یەکەتی / یەکێتی ...

**تێبینی :**

١ ـ وا دەردەکەوێ (ە) چالاکترین پاشگر بێ،کە لەگەڵ ژمارەدابێت .

٢ ـ هەرچی (انە)یە ، دیسان هەر (ە)یە و چووەتە سەر ڕێژەی (دوان ، سیان ...) .

٣ ـ پاشگری (ەتی / ێتی)یش تازەیە .

٤ ـ پاشگری (ە) و (ەتی ڕێتی) • کە دەچنە سەر ژمارە دەیکەن بەناو •

★ لەگەڵ مۆرفێمی ڕیشەییدا :

أ ـ لەگەڵ ناودا •

وەک : ژمارە یەک + ناو •

یەکدڵ

یەکدەست

یەکمال

یەکقسە

یەکشەمە

یەکدەنگ

یەکڕوو

یەکچاو

یەکبال

.........

دوودڵ

دووڕوو

دووقات

دووقەد

دووخەت

........

سێسووچ

سێگۆشە

سێچوکلە

سێ‌پێ

........

چوارپێ

چوارچاو

چوارگۆشه

چوارقوڕنه

........

پێنج‌تیر

........

چل‌چرا

.... ....

شه‌ست‌په‌ڕ

....

هه‌زارپێ

....هتد .

**تێبینی :**

زۆر جار له دوا ئاوه‌كه‌وه هه‌ندێ مۆرفیمی دیش دێ . وه‌ك

١ ـ پاشگر :

أ ـ پاشگری (ـ ه) :

یه‌كشه‌وه

دووڕۆژه

سێ‌ڕۆژه

چوارچێوه

چوارشانه

چوارناڵە

... هتد .

ب ـ پاشگری (ـ ەکی)

دووبەرەکی

چوارخشتەکی

...هتد .

ج ـ پاشگری (ـ انە = ان + ە)

سێ ڕۆژانە

... هتد .

٢ ـ لەگەڵ ئاوەڵناوی ئادیاردا :

یەکتر

یەکدی

...هتد .

٣ ـ لەگەڵ ئاوەڵکرداردا :

دوولا

چوارلا

... هتد .

٤ ـ لەگەڵ جاوگدا :

یەککەوتن

یەکگرتن

یەکبوون

... هتد .



**ژمارەی چەندێتی نـادیار ؟**

بە هەندێ لێکۆڵینەوەی زمانە ئەوروپاییەکاندا ، ئەوە بەرچاو دەکەوێ ، کە هەندێ وشەی وەك : زۆر ، فرە ، گەلێك ، کەم ، هەندێ ، چەند... بە جۆرێك لەژمارە دانراون و لەژێر سەرباسی «ژمارەی چەندێتی نادیار»دا لێیان کۆڵراوەتەوە [٧٨].

بە ڕای من ڕاست نییە ئەو جۆرە وشانە بە ژمارە دابنرێن ، چونکە ئەو گرووپە وشە کەمەی بە «ژمارەی چەندێتی نادیار»دانراوە ، لە باری واتاوە ناتوانێ چەندێتی ژمارە نیشان‌بدا ... نادیاریی ئەم گرووپە وشەیە (زۆر ... فرە ... هەندێ ...) لەو گرووپە وشەیە (یەك ، دوو ...دە ...) جیادەکاتەوە ، کە بەتەواوی سەرژمێریی ئاوێك دەخاتە ڕوو .

بۆ نموونە کە دەوترێ «پێنج کرێکار» ، ئەوە ژمارەی کرێکاران (پێنج)ن و نە چوارن و نە شەش ـ واتە بەتەواوی ژمارەیان دیاریکراوە . بەڵام ئەگەر بوترێ «هەندێ کرێکار» ، ئەوە نەك ژمارەیان نەزانراوە ، بەڵکو دەشێ (دە) کەس بن و دووریش نییە (سەد) .

وشەی چەندێتی نادیاری (زۆر ، کەم...) لە بەکارهێنانیاندا خاسیەت و تایبەتێتی و قالبی وایان لێ دروست دەبێ ، کە ژمارەی بنچی نییەتی . جیاوازیی وشەکانی (زۆر ، کەم ...) لەگەڵ ژمارەی (یەك ، دوو ...)دا ، لەوەدایە کە دەتوانن وەك دیارخەری چەندێتی لەگەڵ

---

(٧٨) بەوێنە :

أ ـ ف. ف. ڤینۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسیی ئەمرۆ (وشەسازی) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ ، ل ٢٢٧ ـ ٢٢٨ .

ب ـ ن. س. ڤالگینا ، د. ن. ڕۆزێنتال ، م. ئی. ڤۆمینا ، ڤ. ڤ. تسابکێڤیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمرۆ ، چاپی چوارەم مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٢٥ ـ ٢٢٦ .

...و گەلێکی دی .

ناوی واتای ڕۆنراودا بێن ، بۆ نموونە (زۆر پیاوەتی ؛ زۆر دۆستایەتی ؛
زۆر جوانی...) ، یاخود لەگەڵ ئاوەڵناودا بێن : (کەم جوان ؛ زۆربەرز) .
دەتوانن پلەی ئاوەڵناو دیاری بکەن (زۆر گەورە ، کەم ڕووناك ...) .
هەرچی ژمارەی بنچی یە لەو حاڵەتانەدا ، کە باسمان کردن بەکارناهێنرێ .
وشەی (زۆر ، کەم ... ) خاوەنی پلەی بەراورد (زۆرتر ، کەمتر ...)و
پلەی باڵا (زۆرترین ، کەمترین ... )ن .

لە ڕووی تایبەتێتی واتا و دەستووری زمانەوە ئەو وشە چەندێتی یە
نادیارانە بە زۆری وەك ئاوەڵکردار بەکاردێن .

وشەی چەندێتی نادیاری (چەند ، ئەوەندە ، هەندێ ...) ئەگەرچی
لە ڕووی پێوەندی یانەوە لەگەڵ ناودا لە ژمارەوە نزیك دەبنەوە ، بەوێنە
(پێنج پرسیار ــ هەندێ پرسیار) و ئیشارەت بۆ ژمارە دەکەن ، بەڵام ژمارە
دەرناخەن . جا بۆیە ڕاستتر وایە لە ڕیزی جێناوی نادیار و جێناوی
پرسیار دابنرێن ...

-١-

# كورته هەڵسەنگاندنێكی
# ئەو كارانەی لە مەیدانی لێكۆڵینەوەی «ناوەلكردار» دا كـراون

لە كتێبی «مختصر صرف و نحوی كوردی»ی مـامۆستا سـەعید صدقی كابانـدا ، (ناوەلكردار)یش وەك (ژمارە) لەگەل بەشە ئاخـاوتنی (ناو)دا باس كراوەو بە جۆرێك لە جۆرەكانی نـاو دانـراوە[1]. وێـڕای ئەوەش ، سـەرپاكی ئـەو باسـەی لـەو بـەرهـەمـەدا پێـوەنـدیی بـەو كێشـەیەوە هەیە ، بریتییە لە چەند دێڕێك لەبارەی (ناوی كـات)و (نـاوی شوێن)ەوە ، كە تێیدا وتراوە :

«ئیسم دوو قیسمە : ١ ـ ئیسمی زەمان ، ٢ ـ ئیسمی مەكان .

ئیسمی زەمـان ـ ئیسمێكـە مـەعنـای زەمـانی تێدا بێ ، یـەعنی دەلالەت لە زەمان بكا . وەكو : ئەمڕۆ ، ڕۆژ ، سەعات ، دەقیقە ، دوێنێ ، پێرێ ، وەقت ، مانگ ، ساڵ ، پار ، پێرار ...

ئیسمی مەكان ـ ئیسمێكە دەلالەت لە مەكان بكا . وەكو : سەر ، ژێر ، پێش ، پشت ، تەنیشت ، دوور ، نزیك ، ئێرە ، ئـەوێ ، لا ، ناو ... » (ل٢٤) .

---

(1) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی كوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ل٢٤

باسی ئاوەڵکردار لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»ی مامۆستا تۆفیق وەهبی دا[2] بریتییە لە پێناسەیەك و چەند نموونەیەك ، کە تێیدا وتراوە :

«زەرف کەلیمەیەکە کە بۆ تەواوکردنی مەعنای فیعلێ یان سفەتێ یان زەرفێکیتر بەکەڵك ئەهێنرێ . سفەتێ چۆن مەعنای ناوێ تەواو ئەکا . ئەمیش هی سیفەت و فیعل و زەرف تەواو ئەکا ، وەکو :

ئەو زۆر ئەنوێ

لێرەدا (زۆر) زەرفە ، فیعلی (ئەنوێ) تەواو ئەکا .

بەفرێکی زۆر ئەستوور باری

لێرەدا (زۆر) زەرفە ، سفەتی (ئەستوور) تەواو ئەکا .

ئەو زۆر خێرا ڕۆیی

لێرەدا (زۆر) زەرفە ، زەرفی (خێرا) تەواو ئەکا» (ل ١٧ ـ ١٨) .

شایانی باسە ، مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی «ڕێزمانی کوردی»دا ئاوەڵکرداری بە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ داناوە و بە شێوەیەکی سەرکەوتوو لێی کۆڵیوەتەوە[3] و لە چوار لایەنی گرنگی دواوە :

١ ـ پێناسەی ئاوەڵکردار (ل١٨٦)

٢ ـ ئەرکی ئاوەڵکردار لە ڕستەدا (ل١٨٦)

٣ ـ جۆرەکانی ئاوەڵکردار لە ڕووی ڕۆنانەوە (ل١٨٦ ـ ١٨٧)

٤ ـ جۆرەکانی ئاوەڵکردار لە ڕووی واتاوە (ل ١٨٧ ـ ١٩٢)

---

(٢) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغـــدا ، ١٩٢٩ ، ل ١٨ ـ ١٧ .

(٣) نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٨٦ ـ ١٩٢

ئەگەرچی دەربارەی ئەو پێناسەیەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین بۆ ئاوەلکرداری داناوە ، هەندێ سەرنج و تێبینیمان هەیە و باسی دیاری کردنی ئەرکەکانی ئاوەلکرداریش لە کەم و کورتی بەدوور نی یە ...
بەلام ئەوانە جێ دێلین و چەند ناتەواوی یەکی بەشی سێیەم و چوارەم دەخەینە پێش چاو :

لە کتێبی «ڕێزمانی کوردی»دا باسی ئاوەلکردار لە ڕووی ڕۆنانەوە دوو کەلێنی بنەڕەتیی تێدایە :

١ ـ هەندێ ئاوەلکرداری ناسادە لە ڕیزی سادەکان دانراون .

٢ ـ بە هیچ چەشنێك باسی ئاوەلکرداری داڕێژراو نەکراوە .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە ڕووی واتاوە شەش جۆر ئاوەلکرداری دیاری کردووە :

١ ـ ئاوەلکرداری کات ـ ئەو (ئاوەلکاری تافی)ی پێ وتووە (ل١٨٧ ـ ١٨٨) ،

٢ ـ ئاوەلکرداری شوێن ـ ئەو (ئاوەلکاری شوێنی)ی پێ وتووە (ل١٨٨) .

٣ ـ ئاوەلکرداری چەندێتی ـ ئەو (ئاوەلکاری چەندی)ی پێ وتووە (ل١٨٩)

٤ ـ ئاوەلکرداری چۆنێتی ـ ئەو (ئاوەلکاری ئاوەلناوی)ی پێ وتووە (ل١٨٩ ـ ١٩٠)

٥ ـ ئاوەلکرداری نەفی ـ ئەو (ئاوەلکاری نەفی)ی پێ وتووە (ل١٩٠ ١٩١)

٦ ـ ئاوەلکرداری وەرام ـ ئەو (ئاوەلکاری وەرامی)ی پێ وتووە (ل١٩١ ـ ١٩٢)

ناتەواوی و کەموکورتیی ئەم باسە سێ چەشنە :

١ ـ زۆر وشە ئاوەڵکردار نین و بە ئاوەڵکردار لە قەڵەم دراون .

بەوێنە لەژێر باسی ئاوەڵکرداری کاتدا وشەکانی (بەهار ... زستان ... شەو .. ڕۆژ .. ساڵ .. سەدە) ڕیزکراون . ئاشکرایە ، ئەو جۆرە وشانە ناوی کاتن ... یاخود (نا ، نە ...) ، کە (ئامرازی نەفی)ین بە ئاوەڵکرداری نەفی دانراون ... و گەلێکی دی .

٢ ـ هەندێ ئاوەڵکردار خراونەتە نێو جۆرێك ئاوەڵکردارەوە . کەچی سەر بە جۆرێکی دین .

بۆ نموونە ئاوەڵکرداری (پشتاوپشت ... پاشەوپاش ...) بە ئاوەڵکرداری شوێن دانراون ، بەڵام لە ڕاستیدا ئاوەڵکرداری چۆنێتین .. یاخود (هەمیشە ...) کە ئاوەڵکرداری کاتە لەتەك ئاوەڵکرداری چەندێتیدا دانراوە ... و هەندێکی دی .

٣ ـ چەند جۆرێکی گرنگ لە ئاوەڵکردار یادداشت نەکراوە ، وەك (ئاوەڵکرداری شێوە یان جۆری جێبەجێبوون ؛ ئاوەڵکرداری تەئکیدی؛ ئاوەڵکرداری هۆ و مەبەست؛ ئاوەڵکرداری دووبارەکردنەوە)، کەچی دوو جۆری (ئاوەڵکرداری نەفی) و (ئاوەڵکرداری وەرامی) جیاکراونەتەوە... بەڵێ لە زمانی کوردیدا جۆرە ئاوەڵکردارێك بە ناوی (ئاوەڵکرداری نەفی)یەوە هەیە و وشە و دەستەواژەی وەك (هەرگیز ، هەرگیزاوهەرگیز ، بە هیچ جۆرێ ...) دەگرێتە خۆ ، بەڵام نەك ئەو ئامرازی نەفییانەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین بە ئاوەڵکرداری نەفی داناون ... هەرچی وشەو دەستەواژەی (بەڵێ ، ئا ، ئەرێ ، نەخێر ، خراپە ، جوانە ، دروستە ، باشە ، ڕاستە)شە ،کە لەژێر سەرناوی (ئاوەڵکرداری وەرامی)دا ڕیزکراون بە هیچ چەشنێك ئاوەڵکردار نین و بابەتی هەممجۆرن .

لـه کتێبی «اوا ئـو دەسـتـوورا زمـانێ کـوردی»ی مـامـۆسـتـا جگـەرخـوێن‌دا[٤] ئـاوەڵکردار نـەك هـەر وەك بەشـە ئـاخـاوتنێـك جیانەکراوەتەوە ، بەڵکو ئەو دوو کورتە باسەش ، کە لە شوێنی جیاوازدا کراون و پێـوەندییان بـە ئاوەڵکردارەوە هەیـە ؛ یـەکجـار پڕ هـەڵـە و کـەم و کـورتین .

نووسەر لە بـاسی بـەشە ئـاخـاوتنی (نـاو)دا لـە (نـاوی کـات)و (ناوی شوێن) دواوە (ل٢١ ـ ٢٢) . لەژێر باسی ناوی کـاتـدا هـەنـدێ وشەی جۆربەجۆری سەر بە بەشە ئاخاوتنی ناو (شەو ، ساڵ ، ڕۆژ ..)و ژمارە (سێیەك ، چارێك ...) و ئاوەڵکردار (ئێستا ، نەو ، ئیرۆ ...)ی ڕیزکردووە ... ئـەوەی پتر سـەرنج ڕابکێشێ ، ئـەوەیـە ژمـارەیـەك پاشگری : (ـ گـە ، ـ لان ، ـ سـتـان ...)ی کـردووەتـە نـموونـەی نـاوی شـوێـن ...

لە لاپەڕە (٥٥)یشدا بە چەند دێرێك لـە (حـاڵ) دواوە و لـە نێـو نموونەکانیدا ـ (بەسواری) پتر لەبارە ...

مامۆستا محەمەد ئەمین هـەورامانی لـە کتێبی «سـەرەتـایێك لـە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی» دا[٥] ئاوەڵکرداری وەك بەشە ئـاخـاوتنێکی سەربەخۆ جیاکردۆتەوە و زانیاریی باشی لەبارەیەوە تۆمارکردووە ...

نووسەر لەم کتێبەدا لە دوو ڕووی گرنگی ئاوەڵکردار دواوە :

---

(٤) جگر خوێن ، ئـاوا ئـو دەستوورا زمـانێ کـوردی ، بـەغـدا ، ١٩٦١ ، ل ٢١ ـ ٢٢ ، ٥٥ .

(٥) محەمەد ئەمین هـەورامانی ، سەرەتـایێك لـە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٥ ـ ١٦٧ .

١ ـ پێناسەی ئاوەڵکردار .

٢ ـ جۆرەکانی ئاوەڵکردار لە ڕووی ڕۆنانەوە .

ناتەواویی دیاری پێناسەکەی لەومدایە ، کە وای دانـاوە گـوایـە ئاوەڵکردار تەنیا «تاریفی فرمان یاخود ئـاوەڵناو دەکـەن » . بـەڵام وەك دەزانین ئاوەڵکردار وێڕای نیشاندانی خـاسیەتی کـردار و ئـاوەڵنـاو . خاسیەتی ئاوەڵکرداریش دیاریدەکا ـ واتە ماناى ئـاوەڵکـردارێکی دی تەواو دەکا[٦] .

لە ڕووی ڕۆنانیشەوە مامۆستا هەورامانی ئاوەڵکرداری بەسەر دوو جۆر : (١ ـ سادە ؛ ٢ ـ لێکدراو)دا دابـەش کـردووە و (ئـاوەڵکـرداری دارێـژراو)و (ئـاوەڵکـرداری دەسـتـەواژەیـی)ی لـە نـێـو دابەش کردنەکەیدا دانەناوە .

لە لاپەڕە (٧٣ ـ ٨٤)ی کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا سێ بـاس بەناوی «ئاوەڵفرمان» (ل٧٣ ـ ٧٦) ؛ «ئاوەڵفرمـانی کات ـ ئاوەڵفرمـانی شوێن» (ل٧٧، ـ ٨٠) ؛ «ئەرکی ئاوەڵفرمان لە ڕستەدا» (ل ٨١ ـ ٨٤)ەوە دەبینرێ . لە کتێبی پۆلی چوارەمی ئامادەییشدا بەنـاوی «ئـاوەڵفرمـانی چۆنی» (ل٦٠ ـ ٦٣)یەوە لە ئاوەڵکرداری چۆنێتی کۆڵراوەتـەوە ...[٧] ئەم باسانەی ئاوەڵکردار لەگەڵ ئەوەشدا کە بە زۆری لە کتێبی «ڕێزمانی

(٦) شایانی باسە ، مامامۆستا تۆفیق وەهبی پەنجەی بۆ ئەو ڕاستییـە ڕاکێشاوە (بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ، ل ١٧ ـ ١٨ ) .

(٧) عەبدوڵلا شالی ، د. عیزەدین مستەفـا ڕەسووڵ ، د. ئـەمین عـەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائـەدین سـەجـادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سەندی ، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧٣ ـ ٨٤ ، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل.٦٠ـ٦٣

کوردی»ی مامۆستا نووری عەلی ئەمینەوە وەرگیراوە[٨] . بەلام دەستێکی باشی پێدا هێنراوە و هەندێ لە کەم و کورتییەکانی لێ لابراوە و ناتەواوییەکانی پڕکراوەتەوە ...

لێکۆلینەوەی تا رادەیەك زانستیو دیار کە لە بارەی (ئاوەلکردار)ەوە نووسرابێ ئەو لاپەڕانەن کە لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ئەو باسانەی تێیاندا کردووە[٩].

لیژنە لە سەرەتادا باسی ئاوەلکرداری لە لایەن هەندێ نووسەرانی ڕێزمانی کوردی و زمانانی بێگانەوە خستووەتە پێش چاو و بەدوا ئەوەدا باسێکی گشتیی ئاوەلکرداری کردووە ...

لێدوانی هەرە سەرکەوتووی لیژنە لەو بوارەدا ، باسی ئاوەلکردارە لە رووی واتاوە ، کە بە باشی لێی کۆلیوەتەوە و نموونەی زۆری بۆ هێناوەتەوە و لە ئەنجامدا نۆ جۆر ئاوەلکردار :

«١ ـ ئاوەلکاری چۆنیتی
٢ ـ ئاوەلکاری زەمانی
٣ ـ ئاوەلکاری شوێنی
٤ ـ ئاوەلکاری وەسفی
٥ ـ ئاوەلکاری تەرتیبی
٦ ـ ئاوەلکاری تەئکیدی
٧ ـ ئاوەلکاری تەکراری
٨ ـ ئاوەلکاری نەفی
٩ ـ ئاوەلکاری پرسیاری »ی دیاری کردووە .

---

(٨) بڕوانە : نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ . ل ١٨٦ ـ ١٩٢ .

(٩) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەپێی لێکۆلینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٨٤ ـ ٣٠٢ .

ناتەواوی ی کەم و کورتیی ئـەم باسەی لیژنە لە چـەند خـاڵێکـدا کۆ دەبنەوە :

١ – جۆری یەکەم و جۆری چوارەم – واتە (ئاوەڵکرداری چۆنی)و (ئاوەڵکرداری وەسفی) یەك شتن و لیژنە بە دوو جۆری داناون . تـەنیـا ئەوەندە هەیە لە ڕووی ڕۆنانەوە نموونەکانی جۆری یەکەم نـاسـادەن و ئەوانی جۆری چوارەم سادەن ، ئەگینا لە ڕووی واتاوە جیاوازییان نییەو دەبوو بە دەستەیەك بەناوی «ئاوەڵکرداری چۆنیتی»یەوە دابنرێ .

٢ – ئاوەڵکرداری چەندێتی نەك هەر بە جۆرێك لـە ئـاوەڵکـردار دانەنراوە ، بەڵکو هەندێ وشەی ئـەو جـۆرە ئـاوەڵکـردارەش ، وەك (زۆر ، کەم ، فرە ، گەلێك ، نەختێ ...) لـەتـەك ئاوەڵنـاوی وەسفیدا ڕیزکراوە (بڕوانە : ل ٢٩٢) .

٣ – دوو جۆری گرنگی ئاوەڵکردار (١ – ئاوەڵکرداری شێوە یـان جـۆری جـێبـەجـێبـوون ؛ ٢ – ئـاوەڵکـرداری هـۆ و مـەبـەست) یادداشت نەکراوە .

٤ – دانانی وشەکانی (کەی ، چۆن ، لـەکـوێ ، چـەنـد ...) بـە ئاوەڵکرداری پرسیاری شتێکی ڕاست نییە ، چونکە ئەو جۆرە وشـانـە ئامرازی پرسیارن و دەوری ئاوەڵکردار نابینن .

...و هەندێکی دی .

دوا باسی ئـاوەڵکرداری لیژنـە بـەنـاوی «ئـاوەڵکـار لـە ڕووی فۆرمەوە»یە (ل٣٠١ – ٣٠٢) ... ئەگەرچی ناوەرۆکی ئەم باسە لـەسـەر بناغەیەکی ڕاست دامەزراوە و بەتایبەتی کە سێ جۆر (١ – ئـاوەڵکرداری سـادە ؛ ٢ – ئـاوەڵکـرداری نـاسـادە : دارێـژراو و لێـکـدراو ؛ ٣ – ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی) جیاکراوەتەوە ، بەڵام کەلێنێکی گـەورە

له بەشی ئاوەڵکرداری ناسادەدا هەیە ، ئەویش ئەوەیە باسی زوربەی ئەو پێشگر و پاشگرانە نەکراوە . کە یاریدەی ڕۆنانی ئاوەڵکرداری داڕێژراو دەدەن و هەروەها شێوەی جۆربەجۆری پێکهاتنی ئاوەڵکرداری لێکدراو یادداشت نەکراوە .

له زوربەی ئەو بەرهەمە زمانەوانییانەدا کە کوردناسانی سۆڤێت : دە قەناتی کوردۆ ، دە چەرکەزی بەکۆ ، دە کەریمی ئەیوبی و دە ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دە ڕ. ل. تسابۆلۆڤ ، دە زارێ یووسف ... پێشکەشیان کردووە ، باسی ئاوەڵکردار کراوە .

دە قەناتی کوردۆ لە باسی ئاوەڵکرداری کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» (١٩٥٧)[١٠] و لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی (بەکەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواوو» (١٩٧٨)دا[١١] پتر بایەخی بە کێشەی ڕۆنان داوە . لە کتێبی یەکەمدا ئاوەڵکرداری بەسەر (سادە) و (ناسادە) و (دەستەواژەیی)دا دابەش کردووە و لە کتێبی دووەمدا (سادە) و (داڕێژراو) و (لێکدراو) و (دەستەواژەیی)ی جیاکردووەتەوە و نموونەی زۆری بۆ هێناونەتەوە ...

لەم باسەی دە کوردۆدا دوو ناتەواوی هەیە ، کە زۆر بەرچاوە :

١ - (لێرە) و (لەوێ) ... کە (لە + ئێرە) و (لە + ئەوێ) ... پێکهاتوون و ئاشکرا دیارە داڕێژراون ، کەچی بە ئاوەڵکرداری سادە دانراون .

---

(١٠) د. قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٢٧١ - ٢٧٧ .

(١١) د. قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨، ل ٢٣٧ - ٢٤٦ .

٣ ـ ئەلی جۆری ئاشکرا و دیاری پێکهاتنی ئاوەڵکرداری داڕێژراو و لێکدراو و دەستەواژەیی ئاونەبراون .

د. چەرکەزی بەکو لە کتێبی «زمانی کوردەکانی سۆڤیێت»دا[١٢] لە ڕووی واتاوە بایەخی بە چوار جۆری سەرەکیی ئاوەڵکردار (١ ـ چۆنێتی ؛ ٢ ـ چەندێتی ؛ ٣ ـ کات . ٤ ـ شوێن)داوە و لەسەر بناغەی کەرەستەیەکی زۆری بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤیێت و بەراوردکردن لە نێوانیاندا شارەزایانە دواوە ... لە ڕووی ڕۆنانیشەوە هەشت جۆرە پێکهاتنی یادداشت کردووە ....

نووسەرانی کتێبی «دیالێکتی کوردی موکری»[١٣] بە لاپەڕە و نموونە باسی چەند ڕێگەیەکی سازبوونی ئاوەڵکرداریان کردووە ....
د. ڕ. ل. تسابۆلۆڤیش لە کتێبی «لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە»دا[١٤] لە دوو لاپەڕەدا لە هەندێ تایبەتیی ئاوەڵکردار و شێوازی پێکهاتنی دواوە .

د. زاری یووسف لە کتێبی «دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی»دا[١٥] ئاوەڵکرداری بەسەر ئاوەڵکرداری ڕەسەن و ئاوەڵکرداری وەرگیراودا دابەش کردووە . مەبەستی لە ئاوەڵکرداری ڕەسەن ئەوەیە ؛ کە هەمیشە

---

(١٢) چ. خ. باکاییف ، زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٢١٤ ـ ٢١٩ .

(١٣) ک. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٥٦ ـ ٥٧ .

(١٤) ڕ. ل. تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣١ ـ ٣٣ .

(١٥) زاری یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی . مۆسکۆ . ١٩٨٥ ، ل ٧٧ ـ ٨٠ .

ە ڕاەی ئاوەڵکردار بەکاردەهێنرێ ، وەك : ئێستا ، ئەوسا ، دیسان .
ئەمیشە ، هەرگیز ، ئەمڕۆ ... مەبەستیش لە ئاوەڵکرداری وەرگیراو .
ەوەیە کە لە بەشە ئاخاوتنێکی دیەوە وەرگیرابێ ...

لە نێوان کوردناسانی ڕۆژئاواشدا ، لە مەکاروس و لە مەکەنزی وەك
اسێکی سەربەخۆ و وەك بەشە ئاخاوتنێك لە ئاوەڵکردار نەدواون .

مەکاروس لە باسی وشەی یاریدەدەردا لە دوا لێکۆڵینەوەی پێشبەند
ە لاپەڕە (٧٨ - ٧٩) دا لە ئاوەڵکردار دواوە[١٦] . لە سەرەتادا لە ڕووی
واتاوە چوار جۆر ئاوەڵکردار : (١ - کات ؛ ٢ - شوێن ؛ ٣ - چۆنێتی
٤ - چەندێتی) ی دیاری کردووە(ل٧٨) .

دواتر بۆ ئاوەڵکرداری کات وشەکانی (دەمەدەم ، دەرحال ،
ووسبەی ، دوایی ، دوێنێ ، ئێستا ، هێشتا ، ئیمڕۆ / ئەمڕۆ ، ئەمساڵ ،
ەمشەو ، پار ، پێرار ، باشەڕۆژ ، سبەی / سبحەینێ ، یەکسەر) و بۆ
اوەڵکرداری چۆنێتی وشەکانی (پێکەوە ، وا ، خاسەتەن ، ئنجا) و بۆ
ئاوەڵکرداری شوێن وشەکانی (ئێرە ، ئەوێ) و بۆ ئاوەڵکرداری چەندێتی
وشەکانی (چەند / چەن ، گەلێ (ك) ، هەموو ، هەندێ(ك) ، هەر ، هیچ
ەختێ (ك) ، زۆر)ی کردووە بە نوونە .

دە مەکنزی لە لاپەڕە (١٢٧ - ١٢٩)دا[١٧] لەژێر باسی (پارتیکڵ)دا
اسی هەندێ لەو پاشگرانەی کردووە ، کە یاریدەی ڕۆنانی ئاوەڵکردار
ەدەن لە بەشە دیالێکتەکانی سلێمانی و پژدەر و ڕەواندز و بنگرد و

16- Ernest N. Maccarus ,A Kurdish Grammar, New-York, 1958, PP. 77-78.

17- D. N.Mackenzie, Kurdish Dialects Studies, London, 1961, PP. 127-129, 201-202.

موکری و زارماوه ••• دا . وەك (ـێ : بەهارێ) ؛ (ـی : یەکی دەسێ بەرگی بۆ دروستکرد ، سالی ڕۆژی••) ؛ ( i )تی : ئەمەش،ئێمەش)•• لە لاپەڕە (٢٠١ ـ ٢٠٢)شدا هەندێ لەو پاشگرانەی لە بەشە دیالێکتەکانی ئاکری و زاخۆ و ئامێدی و سوورچی ••• دا یاریدەی ڕۆنانی ئاوەلکردار دەدەن ، یادداشتکردووە •



لە بەرابی نیشاندانی ئەوەی چی دەربارەی ئاوەلکردار لە زمانی کوردیدا نووسراوە ، دەگەینە ئەو ئەنجامانە :

١ ـ هەندێ لە نووسەران ئاوەلکردباریان لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ناودا باسکردووە ، وەك : سەعید صدقی کابان ، جگەرخوێن ••• بڕێکیش لە باسی وشەی یاریدەدەردا لێیدواون ، وەك : مەکارۆس ، مەکەنزی •• زوربەی زۆریش مامەلەی بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیان لەگەل کردووە ، وەك : نووری عەلی ئەمین ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، د• قەناتی کوردۆ ، د• چەرکەزی بەکۆ ، د• زارێ یووسف •••

٢ ـ زوربەی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە ڕووی واتا و چۆنێتی بەکارهێنانەوە لە ئاوەلکردار نەدواون ، وەك : تۆفیق وەهبی ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، د• ڕ• ل• تسابۆلۆڤ ، د• زارێ یووسف ••• و گەلێکی دی • ئەو بەشە کەمەش کە لێی دواون جیاوازیەکی زۆر لە دابەشکردنەکانیاندا بەدی دەکرێ • بۆ نموونە مامۆستا نووری عەلی ئەمین شەش جۆری دیاری کردووە : (١ ـ کات ؛ ٢ ـ شوێن ؛ چەندێتی ؛ ٤ ـ چۆنێتی ؛ ٥ ـ نەفی ؛ ٦ ـ وەرام) ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد نۆ جەشنی یادداشتکردووە :

(١ ـ چۆنێتی ، ٢ ـ کات ، ٣ ـ شوێن ، ٤ ـ وەسفی ، ٥ ـ تەرتیبی ٦ ـ تەئکیدی ؛ ٧ ـ دووبارەکردنەوە ؛ ٨ ـ نـەفی ؛ ٩ ـ پـرسیـار)... لەگەڵ ئەوەدا ؛ کە هەندێ جۆری دیار و گرنگی ئـاوەڵکـردار دیـاری نەکراوە ، کەچی چەند جۆرێکی ئـەوتۆ جیـاکراونەتـەوە ، کـە بـە هیچ چەشنێك لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێن .

٣ ـ هەندێ ئاوەڵکردار خراونەتە نێو جۆرێك ئـاوەڵکـردارەوە ، کەچی سەر بە جۆرێکی دین . بۆ نموونە ئاوەڵکرداری (پشتاوپشت ... پاشەوپاش ...) بە ئاوەڵکرداری شوێن دانراون ، بـەڵام لـە ڕاستیـدا ئاوەڵکرداری چۆنێتین ... ئاوەڵکرداری (زۆر ، کەم ، فرە ، گـەلێك ، تەختێ ... ) ، ئاوەڵکرداری چەندێتی‌ین و خراونەتە پاڵ ئـاوەڵکرداری وەسفی ... یاخود (هەمیشە) کە ئاوەڵکرداری کاتە لەگەڵ ئاوەڵکرداری چەندێتی‌دا دانراوە ... و هەندێکی دی .

٤ ـ زۆر وشە ئاوەڵکردار نین و بە ئاوەڵکردار لەقـەڵـەم دراون ، بـەوێنـە وشـەکـانی (بـەهـار .. زستـان .. شـەو .. ڕۆژ .. سـاڵ سەدە ... ) ، کە ناون مامۆستا نووری عـەلی ئەمین بـە ئاوەڵکـرداری داناون ... هەروەها ئامرازی نەفی (نا ، نە ...)شی هەر بە ئاوەڵکردار لەقەڵەم داوە ... یاخود مامۆستا جگـەرخوێن ، نـەك هـەر وشـەکـانی (شەف ، ساڵ ، ڕۆژ ...) ، کە ناون و (سێ‌یـەك ، چـارێك ...) ، کـە ژمارەن وەك ئاوەڵکردار تەماشاکردووە ، بەڵکو هـەندێ پـاشگـریشی : (ـ گە ، ـ لان ، ـ ستان ...) هەر بە ئـاوەڵکـردار دانـاوە... کـەچی بەپێچەوانەوە گەلێ وشە و دەستەواژە ، کە ڕوون و ئاشکرا ئاوەڵکردارن، نەناوبراون و نە یادداشت‌کراون .

٥ ـ ئەگەرچی بەشی زۆری نووسەران لە رووی رۆنانەوە لە
ئاوەڵکردار دواون ، بەڵام چەند هەڵە و ناتەواوییەك بەرچاو دەکەوێ :

أ) هەندێ نووسەر ژمارەیەك ئاوەڵکرداری ناسادەیان لە ریزی
سادەکان داناوە .

ب) گەلێ لە نووسەران (ئاوەڵکرداری دارێژراو) و (ئاوەڵکرداری
دەستەواژەیی)یان لە نێو دابەشکردنەکەیاندا رەچاو نەکردووە .

ج) باسی زۆربەی ئەو پێشگر و پاشگرانە نەکراوە ، کە یاریدەی
رۆنانی ئاوەڵکرداری دارێژراو دەدەن و هەروەها شێوەی جۆربەجۆری
پێکهاتنی ئاوەڵکرداری لێکدراو یادداشت نەکراوە .

- ٢ -

## لێکۆڵینەوەکانی خۆم لەبارەی «ئاوەڵکردار»ەوە

ئاوەڵکردار وەك بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن لەسەر بناغەی خاسیەتی وشەسازی و ئەرکی ڕستەسازی و واتاناسییەوە[1] جیادەکرێتەوە .

ئاوەڵکردار خاسیەتی ڕوودان (کە کردار دەریدەبڕێ) ، خاسیەتی خاسیەت (کە ئاوەڵناو دەیگەیەنێ) ، خاسیەتی بارودۆخ (کە ئاوەڵکردار نیشانی دەدا) دیاری دەکا . ئاوەڵکردار چۆنیێتی ، یان ڕادەی ڕوودان . یان ڕادەی چۆنیێتی شتێك . یان بارودۆخی جیاوازی ڕوودانی کارێك : شوێن ، کات ، هۆ ، مەبەست ... ڕادەگەیەنێ .

هەروەها دەشێ بوترێ : ئاوەڵکردار ئەو بەشە ئاخاوتنەیە ، کە بارودۆخ و شێوەی ڕوودان و جۆری چۆنیێتی نیشان دەدا ...ئاوەڵکردار لە ڕووی ڕستەسازییەوە خاوەنی ئەو تایبەتییەیە ، کە لە ڕستەدا بە کردارەوە ، یان ئاوەڵناوەوە ، یان ئاوەڵکردارێکی دییەوە بەندە .

بەوێنە کە دەوترێ «ئازاد زۆر دەخوات» ، ئەوە «زۆر» کە ئاوەڵکردارە ، بە کردارەکەوە بەندە ـ واتە وەسفی کرداری «دەخوات» دەکات . لە ڕستەی «ئازاد زۆر جوان دەنووسێ»دا ـ «زۆر» کە ئاوەڵکردارە بە ئاوەڵناوەکەوە بەندە ـ واتە ئاوەڵناوی «جوان»

---

(١) هەندێ لە زانایان بۆ جیاکردنەوەی ئاوەڵکردار ڕووی واتاناسی بە مەرج دانانێن . بەوێنە ، بڕوانە :

أ ـ ب. ن. گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٥٤ .

ب ـ ئا. ن. گفۆزدییێف ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٣٩ .

دەردەخا ، لە ڕستەی «ئازاد زۆر کەم دەنوێ»دا - «زۆر» کە ئاوەڵکردارە بە ئاوەڵکردارەکەی دیەوە بەندە - واتە ئاوەڵکرداری «کەم» ڕوون دەکاتەوە[2].

* هاتنی ئاوەڵکردار لەگەڵ کرداردا :

**منیش ئەم قەرارەم زۆر پێخۆش بوو**

(لە خەوما ، ل ٣١)

* هاتنی ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵناودا :

**ئەمیش نە زۆر کەڵەگەت بوو نە کورت .**

(لە خەوما ، ل ٦٤)

* هاتنی ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵکرداردا :

**بەخوا ئەگەر (بەد)ی ناوخۆمان لێمان بگەڕێن ، ئێمە بۆ خۆمان زۆر چاک ئەژین .**

(لە خەوما ، ل ٧٠)

ئەگەر لە ڕووی تایبەتێتی واتاناسی و ڕستەسازیەوە ، ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵناو و ناودا بەراوردبکەین ، ئاشکرا هەست بەوە دەکەین ، کە ئاوەڵکردار خاوەنی تایبەتێتی خودی خۆیەتی ... بەشێکی زۆری ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵناودا خاوەنی یەك بنەمان و واتایان وەك یەکە . بەڵام جیاوازیان لە ڕووی دەوری ڕێزمانیەوە هەیە .

ئاوەڵکردار وەسفی کردارێك یان ئاوەڵکردارێك دەکات ... هەرچی ئاوەڵناوە چۆنێتی و خاسیەتی شتێك نیشاندەدا ، کە ناوێك ڕای دەگەیەنێ . بۆ نموونە :

(باش) وەك ئاوەڵکردار : (ئازاد باش وەڵامی دایەوە) .

---

(2) شایانی باسە ، مامۆستا توفیق وەهبی پەنجەی بۆ ئەم ڕاستیە ڕاکێشاوە ( بڕوانە : توفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ١٨ ) .

(باش) وەك ئاوەڵناو : (ئازاد بە وەڵامی باش دەرچوو) .
واش ڕێدەكەوێ هەندێ فۆرمی ناو دەبێتە ئاوەڵكردار ، وەك :
سەربانی ماڵ

وشەی «سەربان» بە ڕەسەن ناوە ، بەڵام لێرەدا واتای (شوێن) دەگەیەنێ و نیشاندانی شوێن مەبەستی سەرەكییە ، بۆیە دەبێتە ئاوەڵكردار .

لە زمانی كوردیدا ئەگەرچی ئاوەڵكردار نیشانەی مۆرفۆلۆژی وای نییە ، كە لە ڕێگەیەوە بتوانرێ وەك بەشە ئاخاوتنێكی سەربەخۆ جیابكرێتەوە ، بەڵام هەندێ خاسیەتی لێكسیكی و مۆرفۆلۆژی و سینتاكسیی ئەوتۆی هەیە ، كە دەبنە بنەمای جیاكردنەوەی لە بەشە ئاخاوتنەكانی دی[٣] .

## جۆرەكانی ئاوەڵكردار لە ڕووی واتاوە

لە لێكۆڵینەوەی ڕێزمانی كوردیدا بۆ بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵكردار بە زۆری دوو دەستە وشە بەدی دەكەین . دەستەی یەكەم ، وشەی وەك : (ئێستا ، ئەمڕۆ ، دوێنێ ، سبەینێ ، هاوینێ ، پار ... گێرە ، لێرە ، لەوێ ، لەژێر ، لەسەر ...) . دەستەی دووەمیش ، وەك : (خێرا ، هێدی ،

(٣) هەندێ لە زانایانی سۆڤێت باسی ئەم تایبەتێتییەیان كردووە ، بەوێنە بڕوانە :
ا ـ ق . كوردۆ ، دەستووری زمانی كوردی (بە كەرەستەی دیالێكتی كرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسكۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢٣٧ .
ب ـ ڕ . ل . تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی كوردییەوە ، مۆسكۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٣١ .

باش ، خراپ . لەسەرخۆ ••• زۆر ، فرە ، کەم •••) ••• بەپێی تایبەتێتی واتا دەکرێ دەستەی یەکەم ناوی (ئاوەڵکرداری بارودۆخ) وەرگرێ و دەستەی دووەمیش ناوی (ئاوەڵکرداری دیارخەر)ی لێبنرێ • بەڵام بەراورد کردنی ئەو دوو دەستە وشەیە ـ (ئاوەڵکرداری بارودۆخ) و (ئاوەڵکرداری دیارخەر) ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکا ، کە لە نێوانیاندا جیاوازی هەیە و وا دێتە پێش چاو ، ئەو وشانەی لە نێو بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵکرداردا خڕیان دەکەینەوە وشەی هەمەچەشن بن •

باس لەوەیە وشەکانی (ئێستا ، ئەمڕۆ •••• ئێرە ، لێرە •••)ی دەستەی یەکەم و وشەکانی (خێرا ، هێدی ••• زۆر ، فرە ••••)ی دەستەی دووەم چ لە ڕووی واتاناسی و چ لە ڕووی ڕێزمان (وشەسازی و ڕستەسازی)یەوە لەیەك دوورن •

وشەکانی دەستەی (ئێستا•••) واتای بارودۆخی ڕووداوێك دەردەبڕن و بە هیچ چەشنێك خاسیەت و چۆنێتی ڕووداوەکە ڕاناگەیەنن و دەربارەی نیشانەکانی هیچ نالێن • بەوێنە کە دەوترێ (ئەو لێرە دەژی) . دیارە وشەی (لێرە) پەنجە بۆ شوێنی ڕووداوەکە ڕادەکێشێ • یاخود ئەگەر بڵێین (دوێنێ چووم بۆ سلێمانی) ، ئەوە وشەی (دوێنێ) کاتی ڕوودانەکە دیاری دەکا •

وشەی دەستەی (خێرا •••) ، بەپێچەوانەوە بارودۆخی ڕووداو ڕاناگەیەنێ • پەنجە نە بۆ شوێن ، نە بۆ کات ڕاناکێشێ ، بەڵکو خاسیەتی چۆنێتی ڕووداوەکە نیشاندەدا • بۆ نموونە وشەی (زۆر) لە ڕستەی «ئەو زۆر پێکەنی»دا خاسیەتی چۆنێتی ڕووداوەکە دیاری دەکا و جیاوازی لەگەڵ ئاوەڵکرداری (لێرە) ـ «ئەو لێرە دەژی»دا زۆرە کە بەتەواوی بە خەتێکی دیدا دەڕوا •

له ڕووی دەوری ڕستەسازی‌یشەوە ، وشەکانی دەستەی (ئێستا)و وشەکانی دەستەی (خێرا) وێک‌ناچن .

وشەکانی دەستەی یەکەم لە ڕواڵەتیاندا دیارە ، کە هیچ پێوەندیيان بە جۆری ڕوودانەکەوە نی‌یە و بەتایبەتی بەو بارودۆخەوە کە تێیدا ڕوودەدا. وشەکانی دەستەی یەکەم وەك بارودوخ (کات ، شوێن ...) خۆیان دەنوێنن و هەر لە بینینی ئەو دەورەشەوەیە بە (بارودۆخ) ناویان‌دەبەین . جا بۆیە لەباری ڕستەسازی‌یەوە لەو ناوانە نزیك‌دەبنەوە ، کە لە ناوەرۆکیاندا واتای حاڵ هەیە . بەوێنە (ئەو لێرە دەژی)و (ئەو لە شار دەژی) ...

ئەم وشانە کە ڕواڵەتیان هیچ پێوەندییەکی بە ڕووداوەوە نی‌یە بە کردارەوە نالکێن و لەگەڵیدا دەستەواژەیەکی وا پێك‌ناهێنن ، کە دیوی ناوەوەیان پتەو پێکەوە بەندبن .

هەرچی وشەکانی دەستەی (خێرا ...)ن لە بواری ڕستەسازی‌دا بە شێوەیەکی دی خۆیان دەنوێنن ـ واتە هەمیشە دەوری ڕوونکردنەوەی شێوەی حاڵەتی ڕوودان دەبینن ، کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ (بارودۆخ)ەکانی دی ڕستە (کات ، شوێن ...)دا جیاوازن .

نیشاندانی ڕووداو لە ڕووی چۆنێتی‌یەوە ، دەبێتە هۆی پێکەوەبەستنی ئەو ئاوەڵکردارانە بە کردارەوە و پێکهێنانی دەستەواژەی وەسفی لێیان . لەم بارەدا پێوەندی ئاوەڵکردار بە کردارەوە ، وەك پێوەندی ئاوەڵناو بە ناوی دیارخراوەوە وایە . بەوێنە (ئەو زۆر دەنوێ) ـ (نوستنی زۆر) ؛ (ئەوان شێرانە دەمرن) ـ (مردنی شێرانە ) .

لەبەر ئەوەی ئاوەڵکرداری دیارخەر خاسیەتی چۆنیی نیشان‌دەدا ، بۆیە مەرج نی‌یە هەر چۆنێتی ڕوودان ڕابگەیەنێ ، بەڵکو دەشێ پەنجە بۆ چۆنێتی خاسیەتی شتی دیش ڕابکێشێ . بۆ نموونە ئاوەڵکرداری جۆری

(خێرا ...) دەتوانێ لەگەڵ ئاوەڵناویشدا یەکبکەوێ ، بەو چەشنەی کە ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا یەکدەکەوێ . وەك (زۆر جوان) ـ (جوانی زۆر ) ... ئەگەرچی بەگشتی ئەو جۆرە دەستەواژانەی لە ئەنجامی یەك کەوتنی ئاوەڵکردار و ئاوەڵناو پێکدێن ، سنووری بەکارهێنانیان تەسکە و گەلێ جاریش لە ڕووی شێوازەوە لەبار نین .

ئەو دوو دەستە وشەیە لە ڕووی وشەسازییشەوە هەندێ جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە ... بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا دەستەی یەکەم بەسەر مۆرفێمدا دابەش ناکرێن و پێوەندیی هەمیشەییان بە وشەی بەشە ئاخاوتنی دییەوە نییە . ئەگەرچی بەپێی خاسیەتی پێکهاتنی وشەسازییان دەشێ لە گرووپی دیاریکراودا یەك بگرن ، بەڵام ئەو گرووپانە تەنیا لەناو ئاوەڵکردار خۆیدا دابەشدەبن ... بەڵێ لە هەندێ حاڵەتدا وا دێتە پێشچاو کە دەشێ بۆ بەرانبەر ڕاگرتنی ئاوەڵکردارێك لە بەشە ئاخاوتنێکی دییەوە وشە بهێنرێتەوە ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو پێوەندییە ئەگەر هەشبێ یەکجار لاوازە[٤] ... ئەمە لە زمانی ئینگلیزیدا بەو چەشنەیە ، ئەگینا لە زمانی کوردیدا چ (ئاوەڵکرداری بارودۆخ)و چ (ئاوەڵکرداری دیارخەر) سادە و ناسادەیان هەیە و پێوەندییان بە بەشە ئاخاوتنی دیشەوە هەیە و زوربەیان لە ناوەوە وەرگیراون .

هەرچی وشەکانی دەستەی دووەمن . پێکهاتنی وشەسازییان چۆن لە زمانی کوردیدا ، بەهەمان شێوە لە زمانی ئینگلیزیدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە و لە بنەمای هەموویاندا ئاوەڵناو هەیە ـ واتە ئەم ئاوەڵکردارانە لە ڕووی وشەسازییەوە پێوەندیی پتەویان بە ئاوەڵناوەوە هەیە و لەسەر بناغەی ئاوەڵناو ڕۆنراون .

---

(٤) ئا. ی. سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ١٧٥ .

ئاوەلـکرداری دیارخەر جگە لەو ڕوونی و ئاشکرایی‌یەی لە پێکهاتنی وشەسازیدا هەیەتی ، هەروەها لە ڕووی زۆری و چالاکی بەکارهێنانیشی‌یەوە لە ئاوەلـکرداری بارودۆخ جیادەبێتەوە ، چونکە وەك ئاشکرایە ، نزیکەی هەموو ئاوەلناوێك دەشێ وەك ئاوەلـکردار بەکاربهێنرێ • هەر لەبەر ئـەو هۆیەشە ، کە لە ئاولکـرداری دیارخـەردا ڕەنگدانـەوەی خاسیـەت و تایبەتێتی‌یەکانی ئاوەلناو هەیە • بەوێنە لە ڕووی ڕستاسازی‌یەوە ، ئاوەلناو چۆن دەبێ بە دیارخەری ناو ، ئاوەلـکرداریش بەهـەمان شێـوە دەبێ بـە دیارخەری کردار ••• لـە ڕووی مۆرفۆلـۆژی‌یشـەوە ئاوەلکـردار وەك ئاوەلناو دەتوانێ نیشانەی پلەی بەراورد و پلەی بالآ وەربگرێ •••

وێکچوونی «ئاوەلـکرداری چۆنێتی» لەگەڵ «ئاوەلناو»دا لە ڕووی واتا و وشەسازی و ڕستەسازی‌یەوە ، پرسیارێك دێنێتـە گۆڕێ : ڕەنگـە (ئاوەلـکرداری چۆنێتی) دەستەیەك وشەی سەربەخۆ نەبن و تەنیا فۆرمـی ڕێزمانیی ئاوەلـکردار بن ، لە بارێکدا کە ئاوەلناوەکە وەسفی ناوێك نەکا ، بەڵکو وەسفی کردارێك یان ئاوەلناوێکی دی بکات ؟

ئەگەر ئەم بۆچوونە وەربگیرێ ، ئەوە دەبێ دان بەوەدا بنرێ ، کـە لە زمانی کوردیدا ئاوەلناو وەك بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن دوو فۆرمی هەبێ : ١ ـ فۆرمی ئاوەلناوی ـ واتە لە بارێکدا کە دەبێتە دیارخەری ناو یان جێناو ؛ ٢ ـ فۆرمی ئاوەلـکـرداری ـ واتە لـە کاتێکـدا کـە دەوری دەرخستنی کردار یان ئاوەلناو دەبینن •••

بەو پێیە دەبێ لە زمانی‌کوردیدا بۆ دەرخستنی‌ناو و ئاوەلناو و کردار یەك بەشە ئاخاوتن هەبێ ، کە ئەو بەشە ئاخاوتنەش ئاوەلناوە ••• هەروەها دەبێ ئاوەلـکرداری دیارخەریش لە ڕیزی ئاوەلـکردار لابرێ • ئێستو ئەمـە وەربگیرێ ، ئەوسا دەبێ جگە لە بوونی تایبەتێتی پلەی بەراورد ، هەروەها

گیرانی دەوری ئاوەڵکرداریش دابنرێ و بەمانە لە بەشە ئاخاوتنی ناو و بەشە ئاخاوتنەکانی دی جیابکرێتەوە .

لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی هەندێ جیاوازی لە نێوان (ئاوەڵکرداری بارودۆخ)و (ئاوەڵکرداری دیارخەر)دا هەیە(٥) ، بەلام یەکێتی پتەوی دەورو ئەرکیان شایەتیی ئەوە دەدەن لە نێو یەك بەشە ئاخاوتندا دابنرێن . کە ئەو بەشە ئاخاوتنەش (ئاوەڵکردار)ە .

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵکردار لە ڕووی واتاوە بەسەر دوو دەستەی سەرەکیدا دابەش دەبێ :

یەکەم ـ ئاوەڵکرداری دیارخەر

دووەم ـ ئاوەڵکرداری بارودۆخ

ـ ١ ـ

## ئاوەڵکرداری دیارخەر

ئاوەڵکرداری دیارخەر خاسیەتی ڕوودان ، یان نیشانەی چۆنێتی و چەندێتی ، یان جۆری بەجێهێنان ڕادەگەیەنێ و دەشێ سێ جۆری لێ دیاری بکرێ :

**١ ـ ئاوەڵکرداری چۆنێتی .**

ئاوەڵکرداری چۆنێتی واتای چۆنێتی ڕوودان یان دەلالەت نیشاندەدا . وەك :

---

(٥) شایانی باسە ، جیاوازیی نێوان ئەو دوو دەستە ئاوەڵکردارەی کوردی، زۆر کەمترە لەوەی لە زمانی ئینگلیزی و هەندێ زمانی دیدا هەیە .

خێرا . هێدی . هێمن . جوان ، باش ، خراپ ...بەژیری ، بەسواری ، بەگورجی ، بەخۆشی ، بەپەلە ، بەگوڕ ، بەکوڵ ... لەسەرخۆ ، لەسەرلا ، لەسەرسنگ ، لەسەرپشت ... بانەوبان ، شاخەوشاخ ... ڕند ، خراپ ، تەمز ، ئارام ...

چەند نموونەیەك :

ورد -

**بە باغچەی پاشادا ورد گەرام ، خوار و ژوور ،**

**زەرد هەبوو ، بۆم چنیبت ، چنگ نەکەوت گوڵی سوور .**

**(گۆران ، ل ١٧)**

بەخۆشی -

**ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە**

**جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە**

(پیرەمێرد ، ل١١٩)

ڕند -

**هەردوو ماعرا گوهداری خەبەردانا وان دکرن ؛ وانا ڕند بهیست چ گلی عەلی مەحمەد گلی' کر .** ( کوردۆ ، ل٣٨ )

دەبینین وشەکانی (خێرا . هێدی . جوان ... بەپەلە ... لەسەرخۆ ... لەسەرسنگ ... بانەوبان ... ڕند ... ) ڕوودان لە ڕووی چۆنێتییەوە دیاریدەکەن . ئەم جۆرە ئاوەڵکردارانە لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا وەلامی پرسیاری (چۆن ؟)[٦] - (چلۆن ؟ ، کوو ؟)و لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا وەلامی پرسیاری (چەوا ؟ ، چاوا ؟) دەدەنەوە .

ئەگەرچی بەشێکی زۆری ئاوەڵکرداری چۆنێتی لە بنەڕەتدا ئاوەڵناون ، وەك (خێرا . هێدی ، هێمن ، جوان ، باش ، خراپ.... لەسەرخۆ ... بەپەلە ...ڕند ...) ، بەلام کاتێ چۆنێتیی کردارەکە

---

(٦) بەرانبەر وشەی (چۆن)و هاوواتاکانی ، لە زمانی بلوچیدا (چۆن)و لە زمانی ئاوێستادا (ئا) هەیە .

دیاردەخەن ، وەك : (شەماڵ خێرا دەنووسێ ، نەسرین هێـدی دەڕوات ؛ لانە جوان دانیشتووە ...) دەبنە ئاوەڵکردار . هەر لەبەر ئەوەشە ، ئـەو جۆرە وشانە تەنیا لە ڕستەدا دەردەکەون ، کە سەر بە چ بەشە ئاخاوتنێکن .

٢ - ئاوەڵکرداری چەندێتی .

ئاوەلکـرداری چەندێتـی ، چـەندێتـی ڕووداو ، ڕادەی توونـدیی ڕووداو.ئەندازەی چەندێتیئاوەڵناوو ئاوەڵکردار دیاریدەکاو لەدیالێکتی کرمانجیی خوارووودا وەڵامی پرسیاری (چەنـد؟) ؛ (کـەم؟ یـان زۆر ؟) ؛ (تا چ ڕادەیەك؟) ...و لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا وەڵامی پرسیاری (چقا؟) ؛ (چقاس ؟) دەداتەوە .

أ) ئاوەڵکرداری چەندێتی لەگەڵ واتای بەهێز بوون :

زۆر ، فرە ، گەلێ / گەلێك ، یەکجار ، تەواو ... پڕ ... گەلەك

زۆر -

منیش چـونکـە بـە عـومـری خـۆم ئـەحوالی وام نـەدیبـوو ، زۆر ئەترسـاام . ( لە خەوما ، ل ٣٠)

دۆستیی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تەئریـخ شاهیـدە
ناحەزی ڕووڕەش لە داخا با بەخـەی خـۆی دادڕێ

(بێ کەس ، ل٨٣)

گەلێ -

لە گەرووی شـمشـاڵ ، لـە تەلی کەمـان
گەلێ هەلسـاوە ئـاوازی جـوان جـوان

(گۆران ، ل ١٠)

گەلەك -

مەمێ ئاخم هەجباند گەلەك خەلاتێن باش دانـە سەراجانـە
ئالم گشـکی خەملاندینـو ب چینانـــە

(مەمێ ئالان ، ل ٤٥)

ب) ئاوەڵکرداری چەندێتی لەگەڵ واتای بێ هێزبوون :

کەم / کەمێ / کەمێك ، پچێك ، نەختێ / نەختەك ، تۆزێ / تۆزێك...

کێــم ...

کەمــێ ــ

تــو خــوا ئاوەکــەی بــۆن گوڵاوەکـــە

بـــۆ ســەرچــاوەکـــە کـــەمــێ لاوەکــە

(پیرەمێرد ، ل ١٢٥)

نەختــێ ــ

بەســـەرهـــاتی خــۆت بۆ من بەیــان کــە

دەردی گرانــــم نــەختـــێ ئاسـان‌کــە

(بێ‌کەس ، ل ١٥٢)

تۆزێــك ــ

کابرای خانچی سەرێکی لێ لەقاندم و ... تۆزێك پێکەنی .

(لە خەوما ، ل ٣٦)

تێبینــی :

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێ وشە هەیە ، وەك (قووڵ ، دوور ، پــان ، بەرز ، نزم ...) ، کە واتای ئەندازە و پێوانەیان تێدایە و دەکەونە نێــوان هەردوو ئاوەڵکرداری چۆنێتی و ئاوەڵکرداری چەندێتی‌یەوە :

نزیك ، دوور ــ

ویـــڵ و ئـــاوارەی ئێلـــی مرادیــــم

نزیــك لــە مەرگــم دووریش لە شادیــم

(پیرەمێرد ، ل١٢٦)

٣ ــ ئاوەڵکرداری شێوە یان جۆری جێ‌بەجێ‌بوون .

ئەم ئاوەڵکــردارە شێوەیــەك یان جــۆری جێ‌بەجێ‌بــوونی کارێــك نیشان‌دەدا و وەڵامی پرسیــاری (چــۆن؟) ؛ (بــە چ جۆرێــك؟) ؛ (بــە چ

شێوەیەك؛) : (بە چ چەشنێك ؟ ) ... دەداتەوە . لە دیالێكتی كوردیی ژووروووشدا پرسیاری (چ جورە؟)ی بۆ دادەنرێ ...[7]

بەشێك لە ئاوەلكرداری شێوە یان جۆری جێبەجێبوون، دەشێ لە ڕێگەی بەراوردكردن یان لێكچواندنەوە دیاریبكرێ ، وەك :

شێرانە . ژیرانە . ئازایانە . پیاوانە . مەردانە . منداڵانە ...
كوردانە . تۆنداسایی ... وەك پایز . وەك گەڵا ، وەك جاری جاران ...

شێرانە ـ

**ڕۆنە ، لای لایە ... (شێركۆ ) لای‌لایە ...**

**باخوا شێرانە بێینە ناو گایە ...**

( بێ‌كەس ، ل ١٥٣)

**وەكو** شێت ـ

**...بێپەروا وەكو شێت ڕاپەڕیم .**

( لە خەوما ، ل ٣٥ )

بەشێكی دی‌یان لە ڕستەدا بەدوایەكترهاتنی كردارەكە نیشاندەدەن . وەك :

دەستەدەستە . پۆل‌پۆل . تاقم‌تاقم ، یەك‌یەك ، قوم‌قوم ،تنۆك‌تنۆك . كەم‌كەم ، وردەوردە ... هێدی‌هێدی ، چیتی‌چیتی[8] ...

پۆل‌پۆل ـ

**...هەر فرِكان‌فرِكانی تەریدە و جەردە بوو . پۆل‌پۆل ئەهاتنە سەر ڕێگەمان .** ( لە خەوما ، ل ٣٠ )

(٧) لە ئاخاوتنی سلێمانیدا (بە چ تەحرێ ؟)و لای كوردەكانی سۆڤێت (چ تەعر ؟ ؛ ب چ تەحری ؟ ) ... بەكاردێ :

... چاوا ئەونێ تێگیرا خوە دیتبوو ، چاوا گرتبوو ، یانی ب چ تەحری كوشتبوو . (كۆودۆ ، ل ٣٧ )

(٨) لەت‌لەت .

گورج گورج ، جوان‌جوان —

**به ڕەوتی کەو ، لەنجەی تاوس و قومری**
**گورج گورج ، جوان جوان ئەهات و جادەی ئەبڕی ...**
**( گۆران ، ل ٣٥ )**

چیتی‌چیتی —

**ماعری ڕەش چیتی چیتی کەون .**

( کوردۆ ، ل ٤٩ )

هێدی‌هێدی —

**پیری گازی مەلەکێد فەنجەیێ کەر .**
**هێدی هێدی خوە نێزیکی دەنگ کەر .**
**( سیابەند و خەجێ ، ل١٩ )**

دوا بەشیش ، ئەو وشانەن کە گشتیتی شێوەی ڕووداندکە و ئەنجومهێنانی ڕادەگەیەنن . وەك :

بەدووقۆلی . پێکەوە[٩] ، بەگشتی ...

پێکەوە —

**سا تۆ خوا ، خێراکە ، با بڕۆین ، دەستبگرین ،**
**بە کامی دڵساری پێکەوە هەڵپەڕین ! ...**
**(گۆران ، ل ١٦)**

## — ٢ —

## ئاوەڵکرداری باروددۆخ

ئاوەڵکرداری بارودۆخ یاریدەی نیشاندانی پێوەندیی ڕوودان بەکات و شوێن و هۆ و مەبەست و تەئکید و دووبارەکردنەوە و لەفی ئەداث و دەشێ بەسەر شەش جۆردا دابەش بکرێ :

---

٩) بەرانبەر (پێکەوە)ی کوردی لە ئاوێستادا (هەدە)یە لە هیندیی کۆنـدا (ئیهە ، کوهەن ، سەهە)ە هاتووە .

۱ ـ ئاوەلکرداری کات .

ئاوەلکرداری کات پەنجە بۆ دەمی بەجێهێنانی کارێك ڕادەکێشی و وەلامی پرسیاری (کەی[10] ؟ ، کەنگێ؟ ، کەنگی؟ ، کەنگین ؟ ، کەنگینێ؟ ، کەینێ؟ ) ،(لە کەیەوە ؟) ، (تا کەی؟ ) ، (چ کاتێ؟ ، چ وەختێ؟ ، چ چاخێ؟ )... دەداتەوە . بۆ نموونە :

ئێستە/ئێستا[11] ، ئەمڕۆ ، سبەی/سبەینێ ، دوێنێ ، پێرێ ، ئێوارە/ئێوارێ ، بەیانی ، نیوەڕۆ ، چێشتەنگاو[12] ، شەوێ ... دەستبەجێ ، یەکسەر ... هاوینێ ، زستانێ ، پایزێ ، بەهارێ ... بەم زووانە ، لەم ڕۆژانەدا ، چەند ڕۆژێکی دی ، جاران ، ئەمساڵ ، پار ، پێرار ... پار تا پێرار ، دەمێکە ، لەمێژە ، هەمیشە[13] ، هەندێ جار ...لەمەولا ، لە زووەوە ، لەو ساوە ، لە سەرەتاوە ... تا بەیانی ، تا مردن...نها / نهۆ، شەقێ ، سبا ، ئێڤارێ/ئێڤارا ، بەرێ ، ئیرۆ ...

ئێستە ـ

گریانی من و خەندەیی تۆ ئێستە دەشوبهێ
بە مەوسیمی بارانە کەوا خونچە دەپشکووت
( نالی ، ل ۱٥۳ )

ئەمڕۆ ـ

کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە
چەندە هەڵبەندی ئێمە شیرینە
( پیرەمێرد ، ل۳٥٥)

---

(۱۰) بۆ (کەی)و هاوواتاکانی لە ئاوێستادا (دا)و (کەدە)و (یەدا) هەیە و لەپشتۆشدا (کلە) دەوترێ .

(۱۱) بۆ (ئێستە/ئێستا) لە ئاوێستادا (ئەدا) و (تەدا) هەیە .

(۱۲) بۆ (چێشتەنگاو)ی کوردی لە زمانی بلووجیدا (چەشتی) بەکاردێ .

(۱۳) بۆ (هەمیشە)ی کوردی لە ئاوێستادا (همدە) وتراوە .

هەمیشە ـ

ئەزانی بۆچی وا کورد زەلیلە
بێ ناو و نیشان هەمیشە دیلە

( بێ‌کەس ، ل ٩٩ )

نها ـ

...نها ئەز کوشتنا خوە رازیمە

( کوردۆ ، ل ٤٠ )

بەشێکی زۆری ئەو ئاوەڵکردارانە ، بەتایبەتی ( شەو ، ئێوارە ، پار ، بەیانی ، نیوەڕۆ ، هاوین ، زستان ... ) لە بنەڕەتدا ناوی کاتن و دەمێك دەبنە ئاوەڵکردار کە ڕوودانی کردارەکە نیشان‌بدەن[١٤] .

٢ ـ ئاوەڵکرداری شوێن .

ئاوەڵکرداری شوێن ، شوێنی ڕوودانی کارێك یان ڕووی بزووتنەوەی شتێك نیشان‌دەدا و وەڵامی پرسیاری (لە کوێ[١٥]؟ لە کوێندەرێ؟ ...) ؛ (بۆ کوێ ؟)[١٦] ؛ (لە کوێوە؟) دەداتەوە . لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا پرسیارەکە (ل کوی؟) ؛ (کویدا؟) ؛ (ژ کوی؟) ...یە . وەك :

---

(١٤) شایانی باسە ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ئەو ڕاستی‌یەی خستووەتە پێش‌چاو (بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆلینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٩١ ) .

(١٥) بۆ (لە کوێ)و هاوواتاکانی لە ئاوێستادا (دە)و لە زمانە هیند و ئێرانی‌یەکاندا (دهە) بەرچاودەکەوێ .

(١٦) بەرانبەر (کوثرە)ی ئاویستا لە کوردی‌دا (بۆ کوێ)و هاوواتاکانی بەکاردێن .

سەر ، ژێر ، خوار ، بن ، کن ، پاش ، پێش[17] ، ناو/نێـو ،دەر ، بەر ، تەنیشت ، چەپ ، ڕاست ... لەسەر ، لەژێر ، لەخوار ، لەبن...لە سەرەوە ، لە ژێرەوە ، لە خوارەوە ، لە بنەوە ، لە پێشەوە ، لەناوەوە، لە ڕاستەوە ، لە چەپەوە ... بۆ لای سەرەوە ، بۆ لای ڕاست ، بـۆ لای چەپ ... ئێرە[18] ، ئەوێ ، لێرە ، لەوێ[19] ، لێرەوە ، لەوێوە[20] ...تا ئێرە ، تا ئەوێ...لە هەموولا، لە هیچ کوێ...نك / کن، ژ خارێ، ل خارێ ، د ناڤ ، ژێرێ ، ژوورێ ، بنڕا ، ڤڕا ، دوورڤا ...

لەژێر . لەپـاڵ ـ

**لەژێر ئاسمانی شینا ،**
**لەپاڵ لووتکەی بەفرینا ،**
**کوردستان گەڕام ،**
**دۆڵاودۆڵ پێوام .**

( گۆران ، ل ٢٨ )

لەنێـو ـ

**جۆششی و تابە لـەنێـو دیـدەیی گریانمـدا**
**چ تەنوورێکـە لـە تەنـدوورەیی طۆفانمـــدا**

(نالی ، ل ٨٩ )

لـەوێ ـ

**... لەوێ بەچەند پلیکانەیەکدا سـەریان خسـتم**

(لە خەوما ، ل ٤١ )

- ل نـك ـ

---

(١٧) (پێش) لە فارسیی ناوەڕاستیشدا هەر (پێش)ە .

(١٨) بۆ (ئێرە)ی کـوردی لە ئـاوێستـادا (ئـره) هاتـووە و لە فارسیـی ناوەڕاستیشدا (ئێتەر) بەکارهاتووە .

(١٩) بەرانبەر (لێرە ، لەوێ)یش لە ئاوێستادا (ئەثرە) وتراوە .

(٢٠) بەرانبەر (لەوێوە)ی کوردی لە ئاوێستادا (ئەڤەدە) دەبینرێ .

میــری و پادشاهــی مــوویــه‌ك لـنـك مــه‌لایی
نادبم ب مولکــی عالــه‌م یه‌ك ذه‌ره‌یــه‌ك عنایه‌ت

( جزیری ، ل ١٥١ )

نقر ، ناف ـ

مێرگی گوتی : دێ نقر به حورمه‌ت هه‌رم ناف باژێر

( خالید حسین ، ل٨ )

به‌شێکی ئه‌م ئاوه‌ڵکردارانه‌ش ، وه‌ك ( سه‌ر ، ژێر ، ناو ، پێش ، پاش ، چه‌پ ، ڕاست ...) له بنه‌ڕه‌تدا ناوی شوێنن و ده‌مێك ده‌بن به ئاوه‌ڵکرداری شوێن ، که جێگه‌ی ڕوودانی کرداره‌که دیاری بکه‌ن[٢١] .

٣ ـ ئاوه‌ڵکرداری هۆ و مه‌به‌ست .

ئاوه‌ڵکرداری هۆ و مه‌به‌ست په‌نجه بۆ هۆی ڕوودانه‌که ڕاده‌کێشێ و مه‌به‌ستی به‌جێهێنانی کارێك ده‌رده‌خا و وه‌ڵامی پرسیاری (بۆچی؟) ؛ (له‌به‌رچی؟) ؛ (بۆ چ مه‌به‌ستێك ؟)... ده‌داته‌وه ، وه‌ك :

له بێ ئه‌قڵیدا ، له تووڕه‌ییدا ، له ترسا ، له برسا ، له خوشی‌دا ... به خۆڕایی ، له‌به‌رئه‌وه‌ی . چونکه ، به ده‌مخه‌وه‌وه ... له داخا ، له قینا،به ئه‌نقه‌ست ...

چونکـه ـ

هیــچ گــوێ نادیتــه ده‌رد ی ئاواتــم
چـونکـه نــه‌یزانــی بێده‌سه‌ڵاتــم

( بێ که‌س ، ل ٧٦ )

٤ ـ ئاوه‌ڵکرداری ته‌ئکیدی .

ئه‌م جۆره ئاوه‌ڵکرداره ته‌ئکیدکردنه سه‌ر به‌جێهێنانی کارێك

---

(٢١) لیژنه‌ی زمان و زانسته‌کانی کۆڕی زانیاری کورد په‌نجه‌ی بۆ ئه‌و تایبه‌تێتی‌یه ڕاکێشاوه (بڕوانه : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی به‌پێی لێکۆڵینه‌وه‌ی لیژنه‌ی زمان و زانسته‌کانی ، به‌غدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٩٢ ) .

پیشاندەدا ، وەك :

هەلبەت ، هەر ... بێ گومان ، بێ سێ ودوو ، بێ چەندوچوون ...

هەلبـەت ـ

وتیان نابێ ، هەلبەت ئەمە شتێکی لەژێر سەردا هەیە ،

( لە خەوما ، ل ٣٣ )

... ئەو تۆزە پڕ و پیتەیشیان کە ماوە هەلبەت بردوویانە ،

( لە خەومـا ، ل ٣٦)

٥ ـ ئاوەلکـرداری دووبـارەکـردنەوە ،

ئاوەلکرداری دووبارەکردنـەوە پەنجـە بـۆ دووپـات بوونـەوەی ڕوودانەکە ڕادەکێشێ ، وەك :

دووبارە ، دیسان، سەرلەنوێ ، جارێکی دی / جارێکیتر ، هەرجارە/ هەرجارێ هەرجارێك / هەرجارەکی ... ئەمجارەش ...

دیســـان ـ

بولبولی طەبعم ئـەوا دیسـان ئـەدا خوانی دەکـا

نوکتە سەنجی و ، بەذلە گۆیی و ، عەنبەر ئەفشانی دەکا

( نـالی ، ل ١٠١ )

ئەمجارەش ـ

... دواجار سەیرمکرد ، گەورەم ئەمجـارەش بە دەنگێکـی بـەرزەوە وتـــی ...

(لە خەوما ، ل ٥٣ )

سەرلەنوێ ـ

تـازە سـەوزەگیـا سـەرلـەنوێ ئـەڕوێ ،

مەل لـە ماجـەرای عـەیش و نۆش ئـەدوێ !

( گۆران ، ل ١٦٨ )

٦ ـ ئاوەلکرداری نەفی ،

ئەم جۆرە ئاوەلکردارانـە نەفـی کردارەکـە ڕادەگەیـەنن ، وەك : هەرگیز ، هەرگیزاوهەرگیز ، بە هیچ جـۆرێ ، بە هیـچ چەشنـێ ، بـە هیچ شێوەیەك ، بە هیچ ڕەنگێ ، بە هیچ کلۆجێ ...

هەرگیز ـ

عاجز مەبە هەرگیز لە درۆ و ئیفکی حەسوودان
دونیایە ، دەبێ سەگ بووەڕێ ، شیعە بکا سەب
( نالی ، ل ١٣٤ )

هەرگیزاوهەرگیز ـ

بەڵام تەبیعەت هەگیزاوهەرگیز
بێ ڕووناکیە بێ بزەی ئازیز
( گۆران ، ل ١٠ )

**تێبینی :**

هەندێ وشە و دەستەواژە چۆن لە دەستەی ئاوەڵکرداری دیارخەر دادەنرێن . هەر بەو چەشنە دەشێ بخرێنە نێو دەستەی ئاوەڵکرداری بارودۆخیشەوە .

بۆ نموونە (زوو ، یەکسەر ، دەستبەجێ ، درەنگ ...) چۆن پەنجە بۆچۆنێتی ڕوودان ڕادەکێشن ، بەهەمان چەشن دەتوانن کاتی بەجێهێنانی کارێك نیشانبدەن . واتە دەشێ «ئاوەڵکرداری چۆنێتی»و «ئاوەڵکرداری کات» بن .

ئاوەڵکرداری وەك : (بە خۆڕایی ، بە دەمخەوەوە ، بە ئەنقەست ، لە ترسا ، لەبرسا ...) چۆن دەشێ هۆ و مەبەست نیشانبدەن و سەر بە دەستەی گەورەی (ئاوەڵکرداری بارودۆخ) بن ، هەروەها مانای چۆنێتیشیان تێدایە و چۆنێتی ڕوودانیش ڕادەگەیەنن ، بۆیە دەلوێ لە دەستەی گەورەی ( ئاوەڵکرداری دیارخەر )یش دابنرێن .

ئاوەڵکرداری (دوور ، لە دوور ، لە دوورەوە[٢٢] ... نزیك[٢٣] ، لە نزیك ، لە نزیکەوە ...) لەگەڵ ئەوەشدا کە واتای ئەندازە و پێوانەیان

---

(٢٢) بەرانبەر (لە دوور ، لە دوورەوە)ی کوردی لە ئاوێستادا (دوورات) هەیە .

(٢٣) وشەی (نزیك)ی کوردی بەرانبەر (ئەسنەی)ی ئاوێستا دەوەستێ .

تێدایە ، بەڵام بە شێوەیێکی سەرەکی وەسفی کردار دەکەن و بۆیە ڕاست وایە ، بەر لە هەر شت بە ئاوەڵکرداری چۆنێتی دابنرێن ... وێڕای ئەو دوو ئەرکە ، هەروەها پەنجە بۆ شوێنیش ڕادەکێشن و بۆیە هەڵە نییە . ئەگەر لەتەك ئاوەڵکرداری شوێندا باس بکرێن .

## ئاوەڵکردار لە ڕووی ڕۆنانەوە

لە زمانی کوردیدا لە ڕووی ڕۆنانەوە دەکرێ ئاوەڵکردار بەسەر سێ جۆردا دابەش بکرێن :

**١ ـ ئاوەڵکرداری سادە .**

ئاوەڵکرداری سادە ئەو ئاوەڵکردارەیە ، کە یەك بنەمای هەبێت . وەك :

خێرا . هێدی ، هێمن ، جوان ، باش ، خراپ ... زۆر ، فرە ، کەم پڕ ... ئێستا ، پار ... سەر ، ژێر ، خوار ، بن ، کن ، پاش ، پێش ناو ، دەر ، بەر ، چەپ ، ڕاست ، دوور ، نزیك... و گەلێکی دی[٢٤] .

**٢ ـ ئاوەڵکرداری نادادە .**

ئەمیش دوو جۆرە :

أ) ئاوەڵکرداری داڕێژراو .

ئاوەڵکرداری داڕێژراو ئەوەیە لە وشەیێکی سادە و زیادی پێکهاتبێت.

---

(٢٤) هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ژمارەیەك ئاوەڵکرداری ناسادەیان بە سادە داناوە . بۆ نموونە :
د. قەناتی کوردۆ (لێرە) ، (لەوێ) ... ، کە لە (لە + ئێرە) ، (لە + ئەوێ) پێکهاتوون و ئاشکرا دیارە داڕێژراون . لەتەك ئاوەڵکرداری سادەدا ڕیزکردووە (بڕوانە : د. قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی ـ بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ـ مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢٣٨) .
...و هەندێکی دی .

ئەوجا زیادی‌یەکە پێشگر یا پاشگر یا هەردوو (پێشگر و پاشگر) پێکەوە بێ •

★ پێشگر :

١ – (بێ–)[25] • وەك :

بێ‌گومان ، بێ‌شك ، بێ‌وچان ، بێ‌ناز •••

٢ – (بە – ) • وەك

بەگوڕ بەکوڵ ، بەتەنیا ، بەپەلە ، بەناو •••

بەناو –

**لەژێر زەردەی خۆرەتاوا ،**
**بەناو چیمەنی گوێ ئاوا ،**

(گۆران : ل ١١ )

بەپەلە –

**یەکێکیان تیابوو ••• بەپەلە قسەی ئەکرد**

( لە خەوما ، ل ٥٢ )

ئەم پێشگرە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (بـ–)دایە • وەك :

بـتەڤایی –

**ئەم گشك چاوا برێ هەڤ حەلال ئەمێ بـتەڤایی شخولێ خوە بکن و بخون •** ( کوردۆ • ل ١٤٤ )

بـلەز –

**حەیوان ئاژۆتە ناڤە شەت ، نهێری کو پری تەنکە ، خوە نادە چۆکانە • دەرباس بوو ژ ناڤێ ، بەرێ خوە دا باژێر ، بـلەز(٢٦) هەسپ دا بەر زەنگویانە •**

(مەمێ ئالان ، ل ٦٦)

---

(٢٥) پێشگری (بێ–)ی کوردی لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی (ئەبێ)دا دەبینرێ ، وەك : «ئەبێ‌گومان»(بێ‌گومان) ••• (بڕوانە : ڕاستەرگویڤا ، ل ٣٦) •

(٢٦) بەلەز – بەپەلە •

له موکریان و گەرمیان و چەند هەرێمێکی دی کوردستان پێشگری (بە-) فۆرمی (وە-)ی وەرگرتووە . وەك :

وەدو -

... مشکیش وەدوی کەوت ، بەخۆشیخۆشی ئەنگوستیلەیان بردە کـن سـەگی .    (تحفهء مظفریه ، ب۱ ، ل ۱۹۹ )

۳ - (لە - ) . وەك :

لەکن ، لەبن ، لەپشت ، لەپێش ، لێرە ، لەوێ ...

لەکـن -

قەصـدی یاریتـە لەکن بـەزمی ڕەقیـب
یاری منە ! خۆت مەکـە بەدخوو بە عەبەث

( نالی ، ل ۱۰٦ )

لەژێـر -

نابێ مـەئیووس بی تـۆ لـەم دونیـایـە
سـەوی بـێ ڕۆژی لـەژێـر خاکـایـە

( بێکەس ، ل ۹۸ )

ئەم پێشگرە لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا لە شێوەی (ل ، د ، ژ ) دایە . وەك :

(ل - ) :

لسـەر -

قەوسی دوو هلالان لسـەر بورجی ئەسـەد بـت
بـۆ شوهرە د عامێ عەمەل ئەنگوشتی توما گـرت

( جزیری ، ل ۱٤۳ )

( د - ) :

دناڤ -

وێ ڕۆژێ بەنگین دبیتە کو دناف بازارێ مەغربانڤا ، ئالە کوتەکە گرانە
( مەمێ ئالان ، ل ٤٣ )

( ژ - ) :

ژنـاف -

...ئەزێ هەرم ژناف وان ژ خومڕا یا لاپە رندە بەدمو بیژێرم ...
(کوردۆ ، ل ٤٤)

لە ناوچەی موکریان و هەندێ شوێنی دی کوردستاندا ئەو ( لە- )یە لە شێوەی (دە-)دا بەکاردێ . وەك :

دەئاوێ -

... سەلا پێی وەڕی ، ئەنگوستیلەکەی لێ دەئاوێ کەوت .
(تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ١٩٩)

دەوێ -

... ڕێوی کونێکی دیبوە ، هەمووی دەوێ کـردن . بۆ خـۆی لە زارکی کونەکـە دانیشـت .
(تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ١٩٣ )

(بێ-)و (بە-)و (لە-) لە بنەڕەتدا پێشبەندن[٣٧] ، بـەڵام کە لـەگەڵ وشەکانی (گومان ، شك ، چارە ... گوڕ ، کوڵ ، تەنیا ، پەلە ... لەکن ، لەبن ، لەپێش ، لەپشت ، لەسەر ، لێرە ، لەوێ ...)دا هاتوون ، لەبەرئەوەی ئەرکی وشەسازییان بەجێهێناوە ، بوونەتە پێشگر و وشەی داڕێژراویان دروستکردووە .

---

(٢٧) مۆرفێمی (بێ)و (لە) لە ڕستەدا ، کە سەربەخۆ دێن ، کارناکەنە سـەر واتای وشەکەی دوای خۆیان - واتە کە یاریدەی ڕۆنانی وشەی نـوێ نەدەن ، ئەوە پێشبەندن . بۆ اموونە :
بێ تۆ هەڵناکەم .
بێ براکەم بۆ هیچ کوێ ناچم .
شـەماڵ بە ئێمـەی وت .
ئازاد بوو بە مامۆسـتا .
سیروان لە شیروان ناچێ .
بەختیار لە ئێمە گەورەترە .

★ پاشـگـر :

١ ـ ( ـ یٚ ) ، وەك :

هاوینیٚ  بەهـارێ ... شـەویٚ ، ئێواریٚ ... سـەریٚ ، خـواریٚ

مۆرفێمی (یٚ) لە ڕەسەندا نیشانەی دۆخی تیانە و بووە بە پاشگر .

(یٚ) وەك پاشگر دەچێتە سەر ناو و ئاوەلکـرداری سـادە و دەیـانکاتـە ئاوەلکرداری داڕێژراوی کات و شوێن .

بەهـاریٚ ـ

**پـاش بەهـاریٚ**
**کاتێك : ڕۆژی لای نیوەڕۆ**
**دەرزی داخـــی لیٚنەبـاریٚ ،**
(گۆران ، ل ٣٤٣ )

ئێڤاریٚ ، سبەهیٚ ـ

**« ...ژ ئێڤاریٚ هەیانی سبەهیٚ ل دۆرا قەسرا مەمیٚ نۆبەتیٚ بگرن »**
( مەمیٚ ئالان ، ل ٤٢ )

٢ ـ (ـان) ، وەك :

**هاوینان** ، بەهاران ... شـەوان ، **ئێواران** ... **سـالآن** ، **جـاران** ، **جەژنـــان** ...

**ئێواران ـ**

**جا بە چوارمەشقی لەسەر ئەرز دانەنیشین کۆمەڵی**
**بەزمـە ئێـواران بـەدەوری عـارەقی مەستیکـەوە**
(پیرەمێرد، ل ١٣٧ )

مۆرفێمی (ان)یش لە بنەڕەتدا نیشانەی کۆیە ، بەلام کە دەچێتە سەر ناوی کات ، دەیکاتە ئاوەلکرداری داڕێژراوی کات و وەك پاشگر خـۆی دەنوێنـێ .

ئەم پاشگرە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە زۆری لە شێوەی
(ا)دا بەدەردەکەوێ . وەك :
شەقا . جارا . سالا ...
٣ - (ـێ - ـێك - ـەك) .
(ـێ / ـێك / ـەك) کە نیشانەی نەناسیاوین، دەچنە سەر هەندێ ناوو
ەڵناو و جێناو و ئاوەڵکرداری چەندێتی‌یان لێ سازدەکەن . واتە لەم
ەدا دەوری پاشگر دەبینن . وەك :

سالێ / سالێك / سالەك
ڕۆژێ / ڕۆژێك / ڕۆژەك
گەلێ / گەلێك / گەلەك
کەمێ / کەمێك / کەمەك
چەندێ / چەندێك / چەندەك

... هتد .

گەلێ -

**لە گەرووی شمشال ، لە تەلی کەمان**
**گەلێ هەڵساوە ئاوازەی جوان جوان**
(گۆران ، ل ١٠ )

گەلێك -

**ئەم قسانە گەلێك جوان و مەعقوولن**
(لە خەوما ، ل ٦٨ )

گەلەك -

**مەمێ تاخم عەجیاند گەلەك خەلاتین باش دانە سەراجانە .**
**تاقم گشکی خەملاندینۆ ب چینانە .**

( مەمێ ئالان ، ل ٤٤ )

٤ ـ (ـانه) ، وەك :

پیاوانه ، ژنانه ، مەردانه ...

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو ـ (پیاو ، ژن ...)و ئاوەڵناو (ژیر ، مەرد ...)ی سادە و دەیانکاتە ئاوەڵکرداری دارێژراو[28] .

٥ ـ (ـەکی) ، وەك :

شەوەکی ، بەیانەکی ...

٦ ـ (ـئاسایی) ، وەك :

شێرئاسایی ، کوێرئاسایی ... تۆئاسایی ، خۆمئاسایی ...

**پێشگر و پاشگر :**

١ ـ پێشگری (بێـ) لەگەڵ :

أ ـ پاشگری (ـانه) ، وەك :

بێباکانه ، بێئەقڵانه ، بێشەرمانه ، بێئاگایانه ...

ب ـ پاشگری (ـی) ، وەك :

بێنازی ، بێئاوی ، بێناوی ، بێشوێنی ...

بێبەری ، بێسەری ...

٢ ـ پێشگری (بەـ) لەگەڵ :

أ ـ پاشگری (ـی) ، وەك :

---

(٢٨) پاشگری (ـانه) هەندێ جار کە دەچێتە سەر ناو و ئاوەڵناو دەیانکاتە ناوی دارێژراو ، وەك (جەژنانه ، بووشانه ... پاکانه ، سوورانه...)

بەزیری ، بەخۆشی ، بەباشی ، بەچاکی ، بەجوانی ، بەوردی ، بەنەرمی ، بەتیری ، بەڕاستی ، بەخراپی ، بەسەوزی ، بەسووری ، بەهەژاری .. بەگشتی ، بەتایبەتی .. بڕاستی ، بپاکی ، بئاقلی[29]..

ب ـ پاشگری (ـەتی / ـیتی) . وەك :

بەگەورەیەتی ، بەسپیەتی / بەسپیتی.. بەپیاوەتی ، بەبرایەتی، بەدزیتی ...

ج ـ پاشگری (ـایەتی) . وەك :

بەدۆستایەتی ، بەدوژمنایەتی ...

د ـ پاشگری (ـایی) . وەك :

بەقوولایی ، بەپانایی ، بەتاریکایی ...

... هتد .

**ب ـ ئاوەلکرداری لێکدراو .**

ئاوەلکرداری لێکدراو ئەوەیە کە وا بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدا بێت .

ئاوەلکرداری لێکدراو دەگونجێ پێك بێ لە :

١ ـ دووپات کردنەوەی ناو ، ژمارە ، ئاوەلناو ، ئاوەلکردار :

أ ـ دووپات کردنەوەی ناو . وەك :

پۆل پۆل ، دەستەدەستە ، تاقمتاقم .

(٢٩) ئەگەرچی (بە کوردی ، بە عەرەبی ، بە تورکی ... بە منداڵی ، بە هەلاجی ، بە بینەچێتی ... و گەلێکی دی) ئاوەلکردارن و بەتەواوی ئەرکی ئاوەلکردار بەجێدێنن ، بەلام لەو نموونانەدا (بە) وەك پێشبەند ماوەتەوە و نەبووە بە پێشگر .

ب ـ دووپاتکردنەوەی ژمارە ، وەك :

یەك یەك ، دوودوو ... شەش شەش ...

ج ـ دووپاتکردنەوەی ئاوەڵناو ، وەك :

جوان جوان ، هێدی هێدی ، وردورد ...

د ـ دووپاتکردنەوەی ئاوەڵکردار ، وەك :

کەم کەم ، زووزوو ، خێرا خێرا ...

... هتد[30] .

٢ ـ دووپاتکردنەوە بەیارمەتی :

أ ـ ناوبەندی (او) ، وەك :

پشتاوپشت ، دۆلاودۆل ، هەرگیزاوهەرگیز ...

ب ـ ناوبەندی ( دو ) ، وەك :

بانەوبان ، پاشەوپاش ، شاخەوشاخ ، ماڵەوماڵ ...

ج ـ ناوبەندی ( بە ) ، وەك :

ڕۆژبەڕۆژ ، ساڵ بەساڵ ، دەستەبەدەستە[31] ... یەك بەیەك ...

یەك ب یەك ، دووب دوو[32] ...

---

(٣٠) لەگەڵ ئەو دووپاتکردنەوەیەدا هەندێ جار بزوێنی (ە) دێت ، وەك : ناوەناوە ، کەمەکەمە ، یەکەیەکە ...

(٣١) هەموو : یەك یەك یاخود دەستەبەدەستە
نانی گیانیان بۆ پڕکردووم لە بەستە ...
(گۆران ، ل ٤٧)

(٣٢) پاشا ئەمر کرا کو هاعر یەك ب یەك ، دووب دوو بێن و بەروانرا بکشن .
(کوردۆ ، ل ٤١ )

د ـ ناوبەندی ( لە ) ، وەك :

یەكلەیەك[٣٣] ، دەستلەدەست ...

٣ ـ ئاوەڵناو + ناوبەندی (بە) + ناو ، وەك :

پڕبەدڵ ، پڕبەدەم ...

٤ ـ ژمارە + ناو یان ئاوەڵكردار ، وەك

یەكجار ، یەكسەر ، یەكشەممە ... دووسبەی ، دووشەممە ...

نیوەڕۆ ، نیوەشەو ... دواجار[٣٤] ...

٥ ـ وشەی (هەر) + ناو یان ژمارە یان ئاوەڵكردار ، وەك :

هەررۆژ ، هەرساڵ ، هەردەم ... هەریەك ، هەردوو[٣٥] هەرلا ...

٦ ـ وشەی (ئەم / ئەڤ)و (ئەو) + ناو ، وەك :

ئەمساڵ ، ئەمشەو ، ئەمڕۆ ... ئەوسا ، ئەوجا ...

ئەڤساڵ ، ئەڤشەڤ ، ئەڤرۆ ... ئەوقاس ...

٧ ـ پێشگری ( لە ) + ( سەر ) + ئاوەڵكردار ، وەك :

لەسەرلا ، لەسەرپشت ...

٨ ـ ( سەر ) + ( بەرەو ) + ئاوەڵكردار ، وەك :

سەربەرەوژوور ، سەربەرەوژێر ، سەربەرەوخوار ...

٩ ـ بە یاریدەی ناوبەندی ( و ) ، وەك :

تێروپڕ ، جاروبار ، گورجوگۆڵ ...

---

(٣٣) ... ئەمە سێ پەردە گۆڕا ، یەكلەیەك ناخۆشتر و خراپتر .

(لە خەوما ، ل ٦٤)

(٣٤) مۆرفیمی (دوا) لە وشەی لێكدراوی (دواجار)دا وەك ژمارە خۆی دەنوێنێ . لە كوردیدا چۆن وشەی (ئەوەڵ) ژمارەیە ، بەهەمان جۆر (دوا)و (ئەخیر)یش دەوری ژمارە دەبینن .

(٣٥) هەریەك ، هەردوو ... لە بنەڕەتدا جێناون ، بەلام دەوری ئاوەڵكردارێش دەبینن .

١٠- بە یاریدەی ناوبەندی ( لە ) • وەك :

سەرلەنوێ ، سەرلەبەر •••

١١- بە یاریدەی ناوبەندی ( وو ) • وەك :

دەمەوڕوو ، دەستەوئەژنۆ •••

٣ - ئاوەلکرداری دەستەواژەیی •

ئاوەلکرداری دەستەواژەیی بەو ئاوەلکردارە دەوترێ ، کە لە دەستەواژەیەك پێكهاتبێ - واتە کۆمەلە وشەیەك بێ و کرداریان لەگەڵ نەبێ •

جۆری هەرە دیار و سادە و چالاکی ئاوەلکرداری دەستەواژەیی ئەوەیە ، کە بە یاریدەی پێشبەند و پاشبەند سازدەبێ :

١ - پێشبەندی ( لە )و :

أ - پاشبەندی ( ەوە ) • وەك :

لە مالەوە ، لە چەپەوە ، لە ڕاستەوە ، لە بازاڕەوە ، لە هەولێرەوە •• لەوێوە ، لێرەوە •• لە سەرەتاوە ••

ب - پاشبەندی ( دا ) • وەك :

لە مالدا ، لە کتێبدا ، لە گیرفاندا •••

ج - پاشبەندی ( ڕا )

لە هەولێرڕا ، لە سلێمانیڕا •••

٢ - پێشبەندی ( بۆ )و پاشبەندی ( ەوە ) • وەك :

بۆ مالەوە ، بۆ ژوورەوە •••

٣ - پێشبەندی ( بە )و :

أ - پاشبەندی ( ەوە ) • وەك :

بە ئاسمانەوە ، بە دارەوە ، بە بەرگەوە •••

ب ـ پاشبەندی (دا) ، وەك :
بە زەویدا ، بە کوندا ، بە دەمدا

٤ ـ پێشبەندی ( تا ، هەتا ... )و پاشبەندی ( ەوە ) ، وەك :
تا ماڵەوە ، تادەرەوە ...
...و گەلێکی دی[٣٦] .

ئەویش چەند نموونەیەك بۆ جۆری ئاسادەی ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی :

★ لای سەرەوە
لای خوارەوە
بۆ لای سەرەوە
بۆ لای خوارەوە
بۆ لای ڕاست
بۆ لای چەپ

★ لە هەموو لا
لەمەولا
لە هیچ کوێ
لەسەر دارەکە
لەبن دارەکە
لەلای دارەکەوە

★ بە هیچ چەشنێ
بە هیچ شێوەیەك

(٣٦) لێرەدا تەنیا چەند نموونەیەکمان هێناوەتەوە و لێی‌شیان نەدواوین ، چونکە ئەم باسە پێوەندی بە کێشەی (پێشبەند و پاشبەند)ەوە هەیە ... کاتێ دەگەینە مەیدانی ئەو بابەتە بە دوور و درێژی لێی دەدوێین .

به هیچ ڕەنگێ

به هیچ کلۆجێ

★ هەفتەی ئاینـدە

سالی نوێ

مانگی داهاتـوو

★ وەك جاری جاران

وەك گەلای دار

...و گەلێکی دی[٣٧] .

پێوەندیی ئاوەڵکردار بە بەشەکانی دی ئاخاوتنەوە نیشانی پەیدابوون و شێوەی پێکهاتنی دەدا .

ئاوەڵکردار پێوەندیی بە ناو و ئاوەڵناو و ژمارە و کردار و جێناوەوە هەیە . ئەو وشانەی لە بەشەکانی دی ئاخاوتنـەوە دەبنـە ئاوەڵکـردار ، پێوەندیی واتایان بە ئەسڵـەکەیانـەوە ناپچڕێ . بـۆ نموونـە ، ئـەو ئاوەڵکردارانەی لە ناوەوە وەردەگیرێن ، پێوەندییان بە واتای شت یان کەس یان بیر ... ەوە هەیە ، وەك : (هاوینێ ، زستانێ ... بەنـاو ... بێناز ... پیاوانە ، ژنانە ...) ... ئاوەڵکردار کە لە ئاوەڵناوەوە هاتبێ خاوەنی واتای چۆنێتییە ، وەك (جـوان ، هێمـن ، خـراپ ... بەپەلـە ، بەخۆشی ، بەتووڕەیی ...)... ئاوەڵکردارێ بە ئاریدەی ژمارە سازبووبێ واتای چەندێتـی تێدایـە ، وەك : (یـەك یـەك ، دووجـار ...)... دەمێ ئاوەڵکردار لە کردارەوە دەکەوێتـەوە ، واتای ڕووداوی تێدایـە ، وەك

(٣٧) لەبەرئـەوەی ئـەم کێشەیـەش باسێکـی سەربەخۆیـە و پێوەندیـی ڕاستەوخۆی بـە (دەستـەواژە)وە هەیـە ، لێرەدا لێـی نادوێیـن و هەڵیدەگرین بۆ کات و شوێنی خۆی .

(بەپاڵکەوتنەوە ، بەدانیشتنەوە ... بەکوڵ ...) ... ئەو ئاوەڵکردارانەش کە لە جێناوەوە پەیدابوون واتای کەس و ژمارە... لە ناوەروکیاندا هەیە : وەك (تۆئاسایی ، خۆمئاسایی ... پێکەوە ...) .

پێوەندیی پتەوی ڕێزمانیی نێوان ئاوەڵکردار و بەشەکانی دی ئاخاوتن ، ڕێماندەدا پێنج جۆری واتایی - وشەسازیی ئاوەڵکردار جیابکەینەوە :

١ - ئاوەڵکرداری ناوی .
٢ - ئاوەڵکرداری ئاوەڵناوی .
٣ - ئاوەڵکرداری ژمارەیی .
٤ - ئاوەڵکرداری کرداری .
٥ - ئاوەڵکرداری جێناوی .

١ - ئاوەڵکرداری ناوی .

دەستەی هەرە چالاکی ئاوەڵکرداری ناسادە ، ئەوانەن کە ناو هاریکاری ڕۆنانیاندەکا . ئەمانیش سێ جۆرن :

یەك - بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر . وەك :
بێگومان ، بێناز ... بەناو ، بەدڵ ...
هاوینێ ، شەوێ .. پیاوانە ، ژنانە ...
بێناوی ، بێئاگایانە ... بەپیاوەتی ، بەبرایەتی ...
... هتد .

دوو - بە یارمەتیی پێشبەند و پاشبەند . وەك :
لە ماڵ ، لە هەولێر ... بۆ ماڵ ، بۆ هەولێر ...
لە ماڵەوە ، لە هەولێرەوە ... لە ماڵدا ، لە هەولێردا ...
بە ئاسمانەوە ، بە دارەوە ... بە کوندا ، بە زەویدا ...
تا هەولێر ... تا ماڵەوە
... هتد .

سێ ـ لە ڕێگـەی دووپاتکردنـەوەی بێپاریدە یـان دووپاتکردنـەوەی بەپاریدەوە • وەك :

پۆل‌پۆل ، دەستەدەستە ، تاقم‌تاقم •••

ئاخەوشاخ ، ماڵەوماڵ ••• ساڵ‌بەساڵ ، ڕۆژبەڕۆژ •••

••• هتـد •

۲ ـ ئاوەڵکرداری ئاوەڵناوی •

ئەم جۆرەش ئەگەرچی ، وەك ئاوەڵکرداری ناوی لە سێ ڕێگـەوە پەیدادەبێ ( ۱ ـ بە پاریدەی پێشگر و پاشگر ؛ ۲ ـ بە پاریدەی پێشبەند و پاشبەند ؛ ۳ ـ دووپاتکردنەوە ) ، بەڵام جۆری دووەم کەم و ستە •

یەك ـ بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر • وەك :

بەگوڕ ، بەپەلە •••

ژیرانە ، ئازایانە •••

بەژیری ، بەخۆشی ••• بەسپیەتی ••• بەپانایی •••

••• هتـد •

دوو ـ بە یارمەتیی پێشبەند و پاشبەند • وەك :

بە گوڕەوە ••• لە گەورەوە •••

سێ ـ دووپاتکردنەوە • وەك :

جوانجوان ، هێدی‌هێدی ، وردورد •••

••• هتـد •

۳ ـ ئاوەڵکرداری ژمارەیی •

ئەو ئاوەڵکردارانەی لە ژمارەوە ڕۆنراون کەمن و بەزۆری لێکدراون و لە ڕێگەی دووپاتکردنەوەی بێپاریدە یان دووپاتکردنەوە بە یاریـدەی ئاوبەندی (بە ، لە •••) سازدەبن • وەك :

یەك یەك ، دوودوو ...

یەك بەیەك ، دووبەدوو ..

یەك لەیەك ، دوولەدوو ...

٤ ـ ئاوەلکرداری کرداری .

وەك :

بە گریان ... بە گریانەوە ...

بە مردوویی ، بە کوژراوی ، بە سووتاوی ...

... هتد .

٥ ـ ئاوەلکرداری جێناوی .

لەنێو ئەو ئاوەلکردارانەدا ، کە لە جێناوەوە سازبوون ، بەر لە هەر شت ، ئەوانەیان دیارن ، کە لە زووەوە لە جێناوی چەندێتییەوە وەرگیراون . وەك :

ئەوەندە ... هێندە ... چەند ...

**بوونی ئاوەلکردار بە بەشە ئاخاوتنی دی**

لەگەڵ بوونی هەندێ بەشە ئاخاوتن بە ئاوەلکردار ، هەروەها دیاردەی پێچەوانەش هەیە ـ واتە کاتێ ئاوەلکردار دەبێ بە بەشە ئاخاوتنێکی دی ...

هەندێ ئاوەلکردار کاتێ مانای بنەڕەتی و ئەرکی سەرەکی وندەبێ ، دەتوانێ ببێتە بەشە ئاخاوتنێکی دی . وەك :

١ ـ بوونی ئاوەلکردار بە پێشبەند .

بەپێی دەق و ڕستە ئاوەلکرداری (پێش ، پاش ، تەنیشت ، پشت ...) دەتوانن دەوری پێشبەند ببینن .

٢ ـ بوونی ئاوەلکرداری (چونکە ، جارێ ...) بە ئامرازی پێوەندی

٣ ـ بوونی ئاوەلکرداری (دیسان...) بە پارتیکل .

... هتد .

# قواعد اللغة الكردية

## المجلد الاول

# ( المورفولوجيا )

## القسم الرابع

# ـ العدد والظرف ـ

بالنظر الى أن المواضيع النحوية تخلط في العديد من الدراسات مع المواضيع الصرفية ولاتعار المقارنات التاريخية الاهتمام اللازم ، فقد تحدثنا في مقدمة هذا الكتاب ، باسهاب ، عن هذين الموضوعين المختلف بشأنهما .

يكمن اختلاف الصرف عن النحو في أن مـاده دراسـه الصـرف هى الكلمة ، وهو يحلل جذور الكلمات . أما موضـوع النحو فهو الحديث عن الجملة ويحلل جذورها في صورة مجموعة من اختلافات الكلمة حتى يبلـغ الكلمات المختلفه التى هى الاجزاء المختلفه للجمله . فها هو النحـو ينهى دراساته في المفردة ، أما الصرف فبالعكس يبدأ دراساته من الكلمة ، الا انهما يتحدثان عنها من جانبين مختلفين ويحللان روابط الكلمة المختلفة في النظام العام للغة .

يلعب آسلوب المقارنه دورا كبيرا في منـاهج دراسه اللغـه . ويمكن اجراء المقارنة لتحقيق هدفين مختلفيـن : لاكتشـاف القـانون العـام ، او الحصول على الحجة التاريخية . يحتاج اللغوي الى الحجة التاريخية ليكون على معرفة اتم واشمل بتأريخ تطور اللغة او العائلة اللغويـة . ويـدل عـلى ضرورة دراسة تاريخ تطور اللغة الموقف المعروف الذى وقفه ف . انكلـز حيث قال : « تتضح مواد وصيغة اللغة الام بالاطلاع على ظهورها وتطورها الهادىء المتدرج والتعمق في ذلك . والا فان لـم يعـر تـلـك الاهتمـام الضرورى ، لم يكن بالامكان معرفة القوالب الميتة لتلك اللغة واللغات الحية والميتة التي ترجع واياها الى عنصر واحد » .

# العـــدد

يتكـون مـوضـوع العـدد من فصلين : يتضـمن الفصـل الاول . وهـو بعنـوان « تقييـم مـوجـز لـلاعمـال الـتى بحثـت العـدد » عرضا مرملا للكتب والرسائل المتعلقـه بالعـدد الـذي هـو جـزء من الكلام ، لاسيما نتاجات السادة سعيد صدقي كابان ، توفيق وهبي ، نوري علي امين . جگرخوين ، محمد امين هوراماني ، لجنه اللغه الكرديه وعلومها في المجمع العلمي الكردي ، أحمد حسن أحمد ، لجنة الدراسات الكردية ، صالح حسين احمد بشدوري ، قناتى كوردو ، جركزى بكو ، كريم ايوبى . ى . ا . سيرنوفا ، مكسيم خمو ، ر . ل . تسابولـوف ، زاري يـوسف . ارنست مكاروس ، د . مكنزى ، د . جويـس بلو وغيرهـم . ومن أجـل استخلاص نتائج من هذه البحوث المهمة وضع الكاتب الحقائق التالية أمام الانظار :

١ ـ تحدث عدد من الباحثين عن العدد في فصل الاسم فوصفوه بأنه نوع من أنواع الاسم . ومن هؤلاء سعيـد صدقي كابـان وجگرخويـن . ووصفه قسم آخر بأنه ضرب من ضروب الصفة . ومن هؤلاء توفيق وهبي ومحمد امين هوراماني وصالح حسين حسن والدكتور قناتى كوردو .

وكما انه ليس بوسعنا بحال من الاحوال القبول بآراء هؤلاء الذيـن اعتبروا العدد اسما في ضوء قواعد اللغة العربية ، لانستطيع كذلك القبول باراء اولئك الذين حسبوا العدد صفه اعتمادا على الاسلوب المتبع في اللغـة الانكليزية ، ذلك لان العدد قسم مستقل من الكلام وله خصائصه . وهذا ما سنبرهن عليه في الفصل الثاني .

٢ ـ يلاحظ اختلافات عديدة بين كتاب قواعد اللغة الكردية ، اذ يقسمون العدد على أنواع مختلفة من حيث خصائصه المعنوية وكيفية استعماله • فعلى سبيل المثال نرى الأستاذ توفيق وهبي يتحدث تارة عن نوعين من العدد هما (١) الاصلي و(٢) الرتبوي ، وتارة أخرى عن ثلاثة أنواع منه هي (١) الاصلي و(٢) الرتبوي و(٣) الكسري • أما الاساتذة سعيد صدقى كابان ونورى على امين وجگرخوين واحمد حسن احمد والدكتور جركزى بكو فقد سجلوا اربعه انواع (١) الاصلى و (٢) الرتبوي و(٣) التوزيعي و(٤) الكسري • اما الدكتور قناتي كوردو فقد سجل ستة أنواع • وهناك كتاب اعتبروه ظروفا من قبيل (يەك يەك) و(دوو دوو) و(سێ سێ) والكلمات العددية المهمة مثل (قليل ، كثير) انواعا من العدد •

٣ ـ سجل بعض المؤلفين اسماء العدد الواقعة بين ١١ ـ ١٩ حسب الطريقة التي يتلفظون بها في السليمانية ، وآخرون سجلوها حسب التلفظ المتبع في اماكن اخرى •

٤ ـ لم يتحدث معظم كتاب قواعد اللغة الكردية عن العدد من حيث البناء • والقسم القليل منهم الذين تحدثوا عنه من هذه الجهه اعتبروا كثيرا من الاعداد المشتقة بسيطة •

(٥) لم يتحدث بعض الكتاب مطلقا عن خصائص العدد الاصلى والعدد الرتبوي والعدد الكسري • والذين تحدثوا عنها منهم لم يعيروا كثيرا من الجوانب المهمة والظاهرة اهتماما ، رغم ان خصائص كل من هذه الاقسام الثلاثة للعدد في اللغة الكردية تجلب الانتباه من وجوه كثيرة ، ورغم ان مجال الحديث عن هذه الاقسام واسع الى حد كبير •

(٦) لم يتحدث اى من كتاب قواعد اللغة الكردية ، باستثناء تسوبولوف ، عن العدد في هذه اللغة ، من حيث المقارنة التاريخية ، اى

لهيجروا لها مقارنة مع اللاغت الاويستائيـة والهنديـة القديمـة والفارسيـة القديمة والمتوسطة والحديثة ولغة البشتو والبلوج ، مع أن هذه المقارنـه توضح لنا امورا غامضة عديدة . والمقارنة التي اجراهـا تسوبولـوف ، هي الاخرى ، في أسماء العدد العشرة الاولى .

اما الفصل الثاني الذي يعد أساسا لهذا الموضـوع فيضطلـع بـدور رئيسي في دراسة تلك المشاكل المهمة التي تخص العدد في اللغة الكرديـة من وجهي المورفولوجيا وعلم اللغة .

عند الحديث عن العدد ينبغي ان نتذكر أن المهم في تحديـد اصنـاف الكلمة والذي نقسم على اساسه اقسام الكلام المختلفة ، هو وجوب وجود رابطة الاشتراك في الخصائص النحوية بين كلمات اى صنف . قد يتحتـم اعطاء هذا الجانب اهميته كاملة . وهذا يجب الاشارة الى انه قد لايؤخذ هذا الجانب بنظر الاعتبار وانما يجرى تميز صنف العدد من الكلام لخواصـه المعنوية فقط ويحدد ككلمة تعطي معنى العدد او مرتبة حسابيـة لاغيـرها . وعلى هذا الاساس فان بعض الكلمات التي تحتوي على مدلول العدد ، تدخل ضمن اطار هذا الصنف من الكلام ، ولكـن هذا النـوع من الكـلام ، في الحقيقة ، انما يحتوي على معنى العدد حسب ، وهو ليس عددا في الواقع . وعلى سبيل المثال اذا نظرنا الى كلمات (حهفته = الاسبوع) و(سهده = القرن) و(حهوت = سبعة) و (سهد = مئة) ، وجدنا ان المدلول العددي يتوفـر في الصنفين على مستوى واحد ، الا ان هناك بينهما فرقا من حيث الخصـائص النحوية وينتمي كل منها الى صنف خاص من اصناف الكلام .

ليس هناك في الحقيقة اى فارق من حيث الخصـائص النحويـة بيـن كلمتي (حهفته = الاسبوع) و (سهده = القرن) واي اسم اعتيـادي اخـر . فكما يصح قول (اربعة رجال ) يصح كذلك قول (اربعة اسابيع) و (اربعـة

قرون) . وكما يصح قول (رجل) و (رجال) يصح كذلك قول (اسبوع) و(اسابيع) و (قرن) و (قرون) ... الخ .

ولئن كان كل من (اسبوع) و (سبعه) و (قرن) و (مئه) متماثلين من حيث المدلول العددي ، الا أن (سبعة) و(قرن) اسما عدد و(اسبوع) و(قرن) اسما جنس تحولا من اسمي عدد الى اسمي جنس .

عندما يقسم كتاب النحو الكردي ونحو اللغات الاخرى اسم العدد على اصناف عديدة من حيث الخصائص المعنوية وكيفية الاستعمال ، نلاحظ اختلافات كثيرة في التقسيمات . فعلى سبيل المثال هناك كتاب لايحسبون الاعداد الكسرية ضربا من اسماء العدد . وهناك آخرون لايصنفون الاعداد الرتبوية ضربا منها . وعلى العكس هناك من يعتبرون ظروف (آحاد) و(مثنى) و(ثلاث) و(رباع) والكلمات الدالة على الكمية مثل (قليل) و(كثير) ضربا من ضروب اسماء العدد .

و عن طريق تقسيم الاعددا التي الفت في ميدان دراسة اسماء العدد ، ووفق تحليلاتنا وآرائنا الخاصة ، ومن خلال الاستفادة من نظريات علم اللغة، توصلنا الى نتيجة تفيد أن بالامكان تحديد ثلاثة انواع من اسماء العدد في اللغة الكردية ، وهي :

١ ـ العدد الاصلي .
٢ـ العدد الرتبوي (نسبة الى رتبة) .
٣ ـ العدد الكسري .

وقد درسنا بالتفصيل الاصناف الثلاثة لاسماء العدد وبذلنا جهدا لتحقيق اصولها وكيفية تكونها واستعمالها ومهامها وخصائصها المتنوعة ،

وقارنا قدر ما اسعفتنا الامكانات المتوفرة بين شكل وصيغة كل اسم عدد مع نظائره في اللغات القديمة والحديثه التي ترجع مع اللغه الكرديه الى اصل واحد ، وقد تمكنا من استنتاج العديد من النتائج •

* * *

## الظـرف

يتكون هذا الموضوع كسابقه من فصلين • الفصل الاول وهو بعنوان «تقييم موجز للاعمال التي بحثت الظرف» • وقد توصل الكاتب في هذا القسم ، بعد بيان بعض ماكتب في اللغة الكردية حول الظرف ، الى استنتاجات وملاحظات منها انه :

١ ـ تحدث عدد من الكتاب عن الظروف ضمن الحديث عن الاسم••• وتحدث عنه عدد آخر منهم ضمن البحث عن الكلمة المساعدة • اما الاكثرية الساحقة فقد تحدثت عنه بوصفه جزء مستقلا من الكلام •

٢ ـ لم تتحدث الغالبية العظمى من الباحثين في قواعد اللغة الكردية عن الظرف من حيث المعنى وعن كيفية استخدامه • اما القسم الضئيل منهم الذين تحدثوا عنه فيلاحظ اختلاف كبير في تقسيماتهم ، فمنهم من ذكر اكثر من ذلك • ومع ان بعض الانواع الظاهرة والمهمة من الظرف لم يسجل ( كالظرف الصوري او كيفية التحقيق او الظرف السببي والظرف المقصود ) •••فقد فصلت اقسام اخرى (كالظرف السؤالى والظرف الجوابى) لاتنسجم بأي حال مع واقع اللغة الكردية •

٣ ـ ادخلت بعض انواع الظروف ضمن انواع اخرى منها مع انها تابعة لانواع غيرها •

٤ ـ هناك كلمات كثيرة ليست ظرفا • ومع ذلك فقد سجلت كذلك مثل (بەهار = الربيع ، زستان = الشتاء ، شەو = الليل ، روژ = النهار ،

سال = السنه ، سەدە = القرن) حيث اعتبرت ظرفا ، او ان ادوات النفي مثل (نه = لا ، نا = كلا) و (كەی = متى ، چۆن = كيف ، لەكوێ = اين، چەند = كەم) للسوال و (سێیەك = الثلث، چواریەك = الربع) وهي من اسماء العدد ، اعتبرت ظرفا • وكذلك اعتبرت بعض اللواحق مثل (گه ، لان ، ستان ) ظروفا •

٥ ـ ليس هناك في اللغة الكردية ما يعتبر ظرف سوآل او ظرف جواب ، ومع ذلك فان معظم الكتاب قد ثبتوه • صحيح ان هناك نوعا من الظرف يسمى (ظرف النفي) ويشمل اشباه جمل مثل (هەرگیز = ابدا ، هرگيز او هەرگیز = ابدا ابدا ••) ولكن ليس كأدوات النفي التي حددها بعض الكتاب •

ويتحدث المؤلف في الفصل الثاني من هذا الكتاب ، بايجاز ، عن خواص الظرف ، ثم يفصل الحديث عنه من حيث المعنى والبناء ، على النحو التالي :

يحدد الظرف خاصيته الوقوع (التي يظهرها الفعل) وخاصيته الخاصية (التي تظهرها الصفة ) وخاصة الوضع (التي يريها الظرف ) ، يعبر الظرف عن كيفية الوقوع او مداه او وقته او مكانه او سببه او غايته •

ويمكن القول ايضا : ان الظرف هو ذلك القسم من الكلام الذي يوضح وضع وكيفية الوقوع ونوع النوعية • الظرف ، نحويا ، هو الذي يملك تلك الخاصيه التي تربط في الجمله بالفعل او الصفه او ظرف آخر •

ومن حيث المعنى حدد الباحث تسعة انواع من الظرف في هذه اللغة ، وهي :

١ ـ ظرف الكمية .
٢ ـ ظرف الكيفية .
٣ ـ الظرف الشكلي او كيفية التحقق .
٤ ـ ظرف الزمان .
٥ ـ ظرف المكان .
٦ ـ الظرف السببي والمقصود .
٧ ـ الظرف التوكيدي .
٨ ـ الظرف التكراري .
٩ ـ الظرف النفي .

يمكن تقسيم الظرف في اللغة الكردية ، من حيث البنـاء ، الى ثلاثـة اقســام :

١ ـ الظرف البسيط ،مثل : خيّرا ، زوّر ، زّر ، پيّش ، پاش .
٢ ـ الظرف غير البسيط ،وهو ايضا ينقسم الى قسمين :

أ ـ الظرف المشتق وهو يتركب بمساعدة السابقة او اللاحقة او كلتيهمـا .

★ السابقة ، مثل : بيَ ـ ، به ـ
★ اللاحقة ، مثل : ـ ى ، ـ ان ، ـ انه ، ـ ەكى .
★ السابقة واللاحقة ، مثل : بيَ ـ انه ، بيَ ـ ى ـ ، به ـ ى ، بـه ـ ەتى ، به ـ يەتى .

ب ـ الظرف المركب وهو ما فيه كلمتان ذواتا معنى على الاقل .

وقد حدد الباحث احد عشر نوعا من هذه الظـروف في اللغـة الكردية .

٣ ـ الظرف شبه الجملة ( العبارة ) .

حدد الباحث اربعة انواع رئيسية وعدة انواع غير رئيسية من هـذا النوع من الظروف .

وفي الختـام تحدث الباحث عن صله الظروف بأقسام الكلام الاخرى وحدد في هذا المجال خمسة انواع من الظروف .

١ ـ **الظرف الاسمي .**

٢ ـ **الظرف الوصفي .**

٣ ـ **الظرف العددي .**

٤ ـ **الظرف الفعلي .**

٥ ـ **الظرف الضميري .**

**هذا** وقد اعتمد الكاتب لاعداد مؤلفه هذا عـلى (٩٤) مـن المصـــادر الكردية والعربية والفارسية والروسية والانكليزية . كما افاد من (١١) كتابا من مراجع الفولكلور الكردي ودواوين الشعراء وقصص الادباء للاتيـــان [illegible] والشواهد اللغوية التي برهن بها على صحة ما ذهب اليه .

# نیشانەی نموونەکان

١ ـ ( بێکەس )

دیوانی بێکەس ، محەمەدی مەلا کەریم رێکی‌خستووە و سەرەتای بۆ نووسیوە و سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٢ ـ ( پیرەمێرد )

پیرەمێردی نەمر ، محەمەد رەسووڵ هاوار ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

٣ ـ ( تحفة مظفریە ، ب ١ )

ئۆسکارمان، تحفە مظفریە، بەرلین، ١٩٠٥، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەسەر رێنووسی کوردی • هێمن موکریانی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٤ ـ ( تحفة مظفریە ، ب ٢ )

ئۆسکارمان، تحفە مظفریە، بەرلین، ١٩٠٥، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەسەر رێنووسی کوردی : هێمن موکریانی ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٥ ـ ( جزیری )

دیوانامەلایێ جزیری، توێژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی،بەغدا ١٩٧٧

٦ ـ ( خالید حسەین )

چەند چیرۆک ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

٧ ـ ( سیابەند و خەجێ )

سیابەندۆڤ سەمەند ، سیابەند و خەجێ ( شوکور مستەفا لە رێنووسی سلاڤی‌یەوە خستوویەتیە سەر رێنووسی کوردی و فەرهەنگۆکی بۆ کردووە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٨ - ( كـوردۆ )

كۆمەلە تێكستی فۆلكلۆری كوردی ، پرۆفیسۆر تەناتی كوردۆ لە زاری كوردەكانی سۆڤیەتەوە تۆماری‌كردووە ٠ شوكور مستەفا و ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر رێنووسی كوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٩ - ( گۆران )

سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەكەم ، دیوانی گۆران ، محەمەدی مەلا كەریم كۆی‌كردووەتەوە و ئامادەی كردووە و پێشەكی و پەراوێزی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

١٠- ( لە خەوما )

جەمیل صائب ، لە خەوما ، پێشكەش‌كردن و لێكۆڵینەوەی جەمال بابان ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

١١ - ( نـالی )

دیوانی نالی ، لێكۆڵینەوە و لێكدانەوە : مەلا عبدالكریمی مدرس و فاتح عبدالكریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

# سـەرچاوە

## بە زمانی کـوردی


(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە، بەغدا ، ١٩٧٤

(٣) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف . ڕێزمانی کـوردی ، بەرگـی یەکـەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

(٤) د. ئەوڕەحمانی حاجی مـارف ، ڕێنـووسی کـوردی لـە ڕۆژنامـەی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کوردی » ، ب١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٧٦ ــ ١٣٢ .

(٥) د. ئەوڕەحمانی حاجـی مارف ، زمانی کـوردی لەبـەر ڕۆشنایـی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٦) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، بەغـــدا ، ١٩٨٦ .

(٧) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا بەغـدا ، ١٩٧٧ .

(٨) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(٩) ف. ئێنگلس ، کـارە کۆکراوەکانی ، چـاپی دووەم ، بـەرگی بیستـەم . مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٣٣٣ .

(١٠) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ، بەغـدا ، ١٩٢٩ .

(١١) جگەرخوێن ، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ .

(١٢) د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .

(١٣) ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، بەسەرداچوونەوەی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری «کاروان» ، ژ٢٣ ، سالی دووەم ، هەولێر ، ئابی ١٩٨٤ ، ل ٢٣ــ٣٥ .

(١٤) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کوڕ ، بەغدا ، ١٩٧١ .

(١٥) زاراوە زانستیەکان ، دانان و لێدوانەوەی لیژنەی زاراوە زانستیەکانی کوڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٦) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .

(١٧) سیامەند سەلیم ، چۆن فێری ئەم سێ زمانە دەبێت ( هیندی ، کوردی عەرەبی ) ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١١ ــ ١٢ .

(١٨) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٩) صالح حسێن حەسەن پشدەری ، کورتەیێك لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

(٢٠) عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قامووسی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٧ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

(٢١) عەبدوڵلا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سەندی ، زمان و ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٢) کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٧٠ .

(٢٣) لیژنەی زمانی کوردی ، بەراوردکاریی لە نێوان زاوە کوردییەکاندا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد » ، ب١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٧٧ ــ ٣٢٧ .

(٢٤) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کوڕ ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کوڕ و لیژنەکانی ، پێشەکی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(٢٥) محەمەد ئەمین هەورامانی ، بەراوردێکی سەرپێیی نێوان زمانی ئاڤێستا و زمانی ئەمڕۆی کوردی ، گۆڤاری «کاروان» ، ژ٥٥ ، هەولێر ، ١٩٨٧ ، ل ٢٤ ــ ٣١ .

(٢٦) محەمەد ئەمیــن هــەورامانــی ، زاری زمــانی کــوردی لە تــرازووی بەراوردکردنا بەغدا ، ١٩٨١ .

(٢٧) محەمەد ئەمین هەورامانی ( سۆتۆیۆف ، زمانی ئاویستا ــ وەرگێڕان و لێدوان و بەراوردکردنی لەگەل زمانی کوردیی ئەمڕۆدا ) ، بەغــدا ، ١٩٨٨ .

(٢٨) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتاییێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغــدا ، ١٩٧٣ .

(٢٩) محەمەد ئەمین هەورامانی ، فەرهەنگی ئێرپەمن قاچ ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

(٣٠) مەسعوود محەمەد ، چارەسەرکــردنی تیروترتەنەکانی ڕێنــووس و ئەلفوبێی کوردی ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد)) ، ب٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٤١ ــ ٢٤٤ .

(٣١) مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارتەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغــدا ، ١٩٧٦ .

(٣٢) نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

(٣٣) نووری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ .


## به زمانی فارســی


(٣٤) دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، تهران ؟ .

(٣٥) دکتر پرویز ناتل خانلری ، تاریخ زبان فارسی ، جلــد اول ، ١٣٥٤ ، جلد دوم ، ١٣٥٤ ، جلد سوم ، ١٣٥٤ .

(٣٦) ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و امــلای فارسی ، تهــران ، ١٣٤٣ .

(٣٧) علی برنالد ، دستور زبان فارسی ، چاپ ششم ، ١٣٥١ .

(٣٨) محمد صدیق مفتی زاده ، درس زبان کردی ، جزوه ١ ــ ٢ ، تهــران ، ٢٥٣٦ .


## به زمانی عەرەبی


(٣٩) الدكتور ابراهيم انيس ، من اسرار اللغة ، الطبعه الرابعه ، القاهــرة ، ١٩٧٢ .

(٤٠) الدكتور ابراهيم السامرائي . فقه اللغه المقارن ، بيروت ، ١٩٦٨ .
(٤١) الدكتور ابراهيم السامرائي ، مباحث لغوية ، النجف ، ١٩٧١ .
(٤٢) توفيق وهبى ، اصل الاكراد ولغتهم ، (( مجلة المجمع العلمي الكردى )) ، المجلد ٢ ، العدد ٢ ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ص ١ ــ ٢٤ .
(٤٣) توفيق وهبى ، قواعد اللغة الكرديه ، الجزء الاول ، البـاب الثانـي ، بيروت ، ١٩٥٦ .
(٤٤) صلاح سعد الله ، حول اللغه الكرديه ، بغداد ، ١٩٨٥ .
(٤٥) عبدالباقي الصافي ، دراسة مقارنه للكلمه وعلم الصـرف فى اللغتيـن العربيه والانكليزيه ، مستل من مجلـه كليـه الاداب جامعـه البصـرة ، العددان ٤ و ٥ .
(٤٦) الدكتور على عبدالواحد وافى ، علم اللغه ، الطبعه السابعه ، القاهرة ، ١٩٧٢ .
(٤٧) محمد سعيد عبدالرحمن ، قواعد اللغة العربيه في النحو والصـرف ، بغداد ، ١٩٧٠ .

به زمانی ڕووسـی

(٤٨) ئۆ. س. ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .
(٤٩) ك. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتـی کـوردی موکـری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .
(٥٠) ئی. م. ئۆرانسکی ، زمانە ئێرانییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .
(٥١) د. ن. ئوشاکۆڤ ، فەرهەنگی زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، بەرگی یەکەم ، ١٩٣٥ ، بەرگی دووەم ، ١٩٣٨ ، بـەرگی سێیـەم ، ١٩٣٩ ، بـەرگی چوارەم ، ١٩٤٠ .
(٥٢) چ. خ. باکایێڤ ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمانستان ، مۆسکـۆ ، ١٩٦٢ .
(٥٣) چ. خ. باکایێڤ ، زمـانی کـوردەکانـی ئازەربـایجـان ، مۆسکـۆ ، ١٩٦٥ .

